پێشەکی:

بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆج ئاڵان کوڕە جووتیارێکی گوندی ئۆمەرلی سەربەشاری ئورفای باکووری کوردستانە کە دەکەوێتە نزیک رووباری فورات و یەکێک لە شارە هەرە دێرینەکانی کوردستانە. مێژووەکەی بۆ دە هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. بەهۆی پێکهاتە کەلتووری، ئەتنیکی و ئایینییە هەمەڕەنگەکانی بەدرێژایی تەمەنە دێرینەکەی، رۆڵی گرنگ و دیرۆکی بینیوە.

یەکێک لە دەڤەرە گرنگەکانی سەرهەڵدانی دایکسالاری، شۆڕشی گوند و کوشتوکاڵە، شوێنی یەکەمین دۆزینەوە و داهێنانەکانی مرۆڤایەتییە؛ جۆرەکانی خۆراک و ئامرازە پەیوەندیدارەکانی، لەم سۆنگەیەوە لەیەکەمین شوێنەکانی سەرهەڵدانی پیرۆزییە.

بەدرێژایی مێژووی خۆی مەڵبەندێکی یاخیبوون و بەرخودانی هەژاران و زۆرلێکراوان بووە دژ بە زۆردار و ستەمکاران. هەربۆیە چەندین چیرۆکی بەرخودانی بێ هاوتا تاکو ئێستاش لەم شارە دەگێڕدرێتەوە و باس دەکرێت. ئەوانەی کە رێبەرایەتی ئەم یاخیبوون و بەرخودانانەشیان کردووە رۆشنبیران و رێزانەکانی ئەو سەردەمەن، واتە پێغەمبەرەکانن؛ لە چیرۆکی پڕ بە ئێشی حەزرەتی ئەیوب کە بە شێوازێکی تایبەت بە خۆی، بەسەبرێکی زۆرەوە بەرگەی ئەوە دەگرێت کە کرم پارچە پارچەی گۆشتی جەستەی بخوات، تاوەکو سەرنجی نەمرودەکان راکێشێت و هەموولایەک رابگەیەنێت کە مرۆڤی (کۆیلە)ش ئازار دەکێشێت و هەست بە ئازار دەکات، تاوەکو دەگاتە پێغەمبەران ئیدریس، یونس و نوح بەتایبەتیش حەزرەتی ئیبراهیم خەلیل کە بەرخودان و سەرهەڵدانە مێژووییەکەی بەرامبەر بە نەمرود (پادشا ـ خوداوەند) ئەنجامدەدات، کەلتوور و نەریتی پێغەمبەرایەتی دەگەیەنێتە لوتکە..

شاری ئورفا سەرەتا مەڵبەندی شۆڕشی گوند و کشتوکاڵ بوو، ناوەندی کەلتووری دایکسالاری، خوداوەندە ژن ـ دایک بوو، شوێنی دۆزینەوەی خۆراک و خواردەمەنی، شوێنگەی ژیان بوو بۆیە بەپیرۆز ناودەبرا، دواتر بوو بە شاری سەرهەڵدانی یاخیبوون و بەرخودانی پێغەمبەران، چەندین پێغەمبەر لەوێ چاویان بەدونیا هەڵێنا، هەربۆیە بەشاری پێغەمبەران ناوبرا.

دواتر هەوری رەشوتاریک دایپۆشی، لەجیاتی پیرۆزی، نەعلەت بووە بەشی ئەم شارە، یاخیبوون و بەرخودانی گەل کپ کرایەوە، ستەمکاران بەناوی پیرۆزی و ئیلاهییەوە دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرت و ژەهریان دەرخواردی خەڵکەکەیدا. ئیتر خوازیاربوون ئەم رەوشە وەکو چارەنووسێکی رەش بەسەر ناوچەکە و خەڵکەکەیدا بسەپێنن.

بەڵام خەڵکی ناوچە کە خاوەن کەلتوورێکی رەسەنی پیرۆزی و بەرخودانە، بەشێوەیەکی شاراوە، درێژەیان بە ماتە وزەی ئەم نەریتە دێرینە دا کە بەیەکەوە ژیانی ئازادانەی گەل، کەلتوور، ئەتنیک و ئایینە جیاوازەکان لەخۆوە دەگرێت. بەردەوام بەدوای دەرفەتێکدا دەگەڕا جارێکی دیکە ئەم کەلتوورە رەسەنە بەکارێگەر بکات.

لەم چوارچێوەیەشدا کاتێک لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی رابردوو شەڕی رزگاری نیشتمانی لە تورکیا لەسەر بنەمای رێککەوتنی کورد ـ تورک پێشکەوت، بۆ پێشخستنی یەکێتی ئازادانە و بەدەستهێنانی دەستکەوتی هاوبەش ئورفا و ناوچەکانی دەوروبەری جێگای خۆیان لەم هەڵمەتە دا گرت، تا دەوڵەتی تورکیا دامەزرێنرا.

بەڵام هێندەی پێنەچوو تورکەکان نکۆڵییان لەم ڕێککەوتنەکرد، گەلی کوردیان بە نەبوو لە قەڵەمدا. یاخیبوون و سەرهەڵدانە یەک بەدوای یەکەکانیان سەرکوت کرد. دوای سەرکوتکردنی سەرهەڵدانەکانی شێخ سەعیدی پیران 1925، هەرە دواییش سەید رەزای دێرسیمی 1938 ئیتر دەیانگوت شتێک بەناوی کورد و کوردستان نییە و نەبووە، تەنانەت گۆڕی سیمبۆلیشیان دروستکرد و نووسیان: کورد و کوردستان لێرە لەگۆڕنران.

قۆناخی دواتر قۆناخی یەک دەوڵەت، یەک نەتەوە، یەک زمان و یەک وڵات بوو کە تورکەکان بەسەر گەلی کوردیان داسەپاند، نکۆڵی و قڕکردن بوو بە سیاسەتێکی باوی پەیڕەوکراو دژ بەکوردان و گەلانی دیکە (جگە لە تورکان). هەرشتێکی ناو و بۆنی کورد و کوردستانی لێ بێت قەدەخەکرا، بە هۆکاری جوداخوازی دانران، ناوی شار، گوند، شاخ، کانی و ئاوەکان گشتی گۆڕان و کران بە تورکی، تەنانەت بە تورکی شاخاوی بەناو دەبرد. نەک تەنیا بەرامبەر بە کوردانی باکووری کوردستان، بەڵکو ڕژێمی فاشیستی دەوڵەتی تورک بەرامبەر بە تەواوی کوردان هەمان هەڵوێستی هەبوو، چاوی بە دەسکەوتەکانی کورد لەهەر کوێیەک بێت هەڵنەهات، بۆیە دژایەتی دەکردن و دەستی لەزۆربەی ڕێککەوتنەکانی دژ بە کورداندا هەبوو، بەرچاوترینیشیان ڕۆڵی بوو لە ڕێککەوتنی جەزائیری 1975.

لە رەوشێکی بەمجۆرەدا وزەی شاراوەی نەریت و کەلتووری رەسەنی ناوچە نەیدەتوانی دەستەوەستان بوەستێت، دیسان دەبوایە ڕۆڵی مێژوویی خۆی ببینێت. هەروەکو چۆن بووە مەڵبەندی بەرخودان بەرامبەر بە نەمرود. ئەمجارەش دەبوایە بزووتنەوەیەکی هاوچەرخی ئیراهیمی بەرامبەر بە نەمرودە نوێیەکان سەرهەڵبدات، چارەنووسی خراپی گەلی کورد، رەنجدەر و هەژاران بگۆڕێت و سنوورێک بۆ ستەم، چەوسانەوە، نکۆڵی و قڕکردن دابنێت، گەل بە ئازادی و سەرفرازی شاد بکات. پەلی هەوری رەش و تاریک بەلاوە بنێت و ڕۆژی روناکی گەلان هەڵبێت.

بەڵی کوڕە جووتیارەکەی گوندی ئۆمەرلی ئەو کەسایەتییە بوو کە وزەی شاراوەی پیرۆزی و رەسەنی ناوچەکەی ڕێکخست، کردی بە هێز و بەرامبەر بە نەمرودە ملهوڕ و خۆ داسەپێنەکان جاری بزووتنەوەیەکی گەلی کوردی رەنجدەر و هەژاریدا، کە خوازیارە ببێتە بزووتنەوەیەکی ئیبراهیمی هاوچەرخ.

بزاڤی ئاپۆچێتی، یاخود بە ناوەکەی تری پارتی کارکەرانی کوردستان (PKK) وەک بزووتنەوەیەکی خاوەندارێتیکردنی پیرۆزی، رەسەنی و کەلتووری ناوچەکە سەریهەڵدا، بزاڤێک کە کۆتایی بە ستەم و زۆرداریيەکانی نەمرودەکانی سەردەم بێنێت. لەم پێناوەشدا لەدوا چارەگی سەدەی بیستەم تێکۆشانێکی ماندوو نەناسانە ئەنجامدرا، فیداکارییەکی بێ هاوتاکرا، قوربانییەکی زۆر پێشکەشکرا؛ لەکاتێکدا بزووتنەوەکە دەسکەوتی گرنگی بەهاداری بەدەست دەهێنا و لە سەرکەوتن و ئازادی تەواو نزیک دەبوویەوە و، ناسنامەی مرۆڤی ئازادی بەرزکردبۆە و ببووە سەرچاوەی ئیلهامی تەواوی بزاڤەکانی هەژاران و رەنجدەران: تەواوی نەمرودەکانی جیهان ترسیان لێ نیشت و ئەو راستییە تێگەیشتن کە چارەنووسی نەمرودەکان گرێدراوی یەکترە و گشتیان بەهانای نەمرودەکانی دەوڵەتی تورکەوە هاتن، بەرامبەر بەم بزووتنەوە کەوتنە ناو پیلان و نەخشەدانانەوە: لە ئاکامدا بە پیلانگێڕییەکی نێو دەوڵەتی لە 1999/2/15 ڕێبەری ئەم بزاڤە، بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆجالانیان دەستگیرکرد و رادەستی نەمرودەکانی دەوڵەتی تورکیان کردەوە.

بەڵی سیستەمی جیهانی نەمرودەکان هەروەکو چۆن سەرەتای سەدەی بیستەمیان بە قەسابخانەی مرۆڤایەتی (شەڕی یەکەمی جیهانی) دەستپێکرد، ئەم سەدەیان بە بێبەختی و غەدرێکی گەورە بەرامبەر گەلی کورد دەست پێکرد: گەلی کورد و وڵاتەکەی کوردستانیان بۆ چوار پارچە دابەشکرد و هەر پارچەیەکیش خرایە ژێردەستی دەوڵەتێکەوە. بەهەمان شێوە بەزوڵم و ستەم و غەدرێکی گەورە کە بەرامبەر گەلی کورد و کوردستانیان کرد خاڵیان بۆ سەدەی بیستەم دانا، ئەویش پیلانگێری نێودەوڵەتی 15ی شوباتی 1999 بوو.

یەکێک لە هۆکارە هەرە سەرەکییەکانی ئەم پیلانگێرییە ئەوەبوو کە بزاڤی هەژاران و رەنجدەرانی کوردستان کۆتاییان بەو دۆخە هێنابوو کە دۆزی کورد وەک کارت و پیۆنێک لەلایەن هێزە هەژموونگەرا نێو دەوڵەتییەکان بەکاربهێنرێت. PKK وەک بزووتنەوەیەکی هاوچەرخ سەربەخۆیی ئیرادە و ناسنامەی کوردی ئازادی بەرزکردەوە: هەموو هەوڵێکی لەپێناو چارەسەری دیموکراتیانەی دۆزی کورد و یەکێتی ئازادنەی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین بوو. ئەمەش لەگەڵ بەرژەوەندیپەرستی پاوانخوازی سیاسی، سەربازی و ئابووری هێزی هەیمەنەی جیهانی نەدەهاتەوە: کە بەرژەوەندییەکانیان لە رێگای شەڕ و ئاژاوە و پشێوی مسۆگەر دەبوو.

نەمرودە جیهانگیرییەکان لەو بڕوایەدابوون کە بەدستگیرکردنی رێبەر عەبدوڵڵا ئۆج ئالان و بەندکرنی لەزیندانی تاکە کەسی ئیمرالی ئیتر دەتوانن کۆتایی بەم بزاڤە گەلەرییە بێنن، دیارە مێژوویان لەبیرکردبوو، کاتێک نەمرود حەزرەتی ئیبراهیمی فڕێدایە ناو ئاگر نەک تەنیا کەلتوور و نەریتەکەی لەناونەچوو، بەڵکو رەگی خۆی بەقووڵی داکوتا. هەربۆیە جارێکی دیکە مێژوو بەنوژەنییەوە دووبارە دەبێتەوە!

دوای ئەوەی بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆج ئالان وەک دیلێک لە زیندانی تاکە کەسی دوورگەی ئیمرالی گیرسایەوە تاکو ئێستا دە ساڵە بەشێوازێکی تایبەت بەخۆی، بە سەبرێکی ئەیوبیانە بەرخودانێکی واتادار و رەسەنانە بەرامبەر بە سیستەمی نەمرودی جیهانی دەکات بەرخودانێک شێوازی قەبە و کوێرانەی بەرخودان تێپەڕدەکات. نوێنەرایەتی ناسنامەی کوردی ئازاد دەکات. لەم بەرخودانەشدا هێزی خۆی لە کەلتووری بەرخودان، پیرۆزی ناوچەکە و رەسەنایەتییەکەی، بیروباوەڕە بەهێز و قووڵاییە فکریەکەی و بەرخودانی گەل و بزاڤەکەی وەردەگرێت. فەلسەفەی بەرگری و بەرخودانەکەشی ئەوەیە: ئەگەر هێزی جیهانمان بەدەستەوە بێت هێرش ناکەینە سەر کەس، ئەگەر تەواوی هێزی جیهانیش هێرشمان بکاتە سەر تەسلیم نابین.

بەڕێز عەبدوڵلا ئۆج ئالان بەهۆی پەیوەستبوونی بە کەلتووری رەسەنی ناوچەکە باوەڕی تەواوی بە یەکێتی ئازادی گەلان هەیە و لەم پێناوەشدا تێکۆشانێکی بێ وچان و بێ هاوتایکردووە، نەک تەنیا لە قۆناخی ئیمراڵی بەڵکو لەساڵی 1993 بەدواوە بەشێوەیەکی بەرچاو لەم بوارەدا هەنگاوی هاوێشتووە، ئاگر بەستی یەکلایەنەی راگەیاندووە بەڵام دەوڵەتی شاراوەی تورک لەلایەک تورکۆت ئۆزالی سەرۆک کۆمارەی کوشت، لەلایەکی دیکەش سیناریۆی کوشتنی 33 سەربازە تورکەکە دارشترا و جێبەجێیان کرد، بەمجۆرە ئەم هەوڵەی PKK بۆ دیالۆگ و رێگەچارەی دیموکراتیانە لەباربرا، لە 1996دا بۆ جاری دووەم، لە 1998 دا بۆ جاری سێیەم ئاگربەستی یەکلایەنەی راگەیاند تاوەکو زەمینەی دیالۆگ و ئاشتی برەخسێت و یەکێتی ئازادانەی نێوان گەلی کورد ـ تورک بەدیبێت. چونکە لەو بڕوایەدابوو کە یەکێتی زۆرەملێیانە بە واتای کۆیلایەتی دێت. لە 1993 بەدواوە لە هەوڵەکانی ئەنجامدانی گۆڕانکارییەکی ستراتیژی و ریشەییدا بوو، تاوەکو لە ساڵی 1998 لەو دیالۆگەی لەگەڵ شۆڕشگێری تورک میهری بەللی ئەنجامیدا بە چوارچێوەیەکی گەیاند و دواتر وەک پەرتووکێک لەژێر ناوی وەرچەرخانی مەزن بڵاوکرایەوە.

بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆج ئالان قۆناخی ئیمراڵی بە میلادێکی نوێ تەنانەت بە سێیەمین لەدایکبوون (میلاد) دادەنێت. یەکەمیان ساڵی هاتنە دونیا، دووەمیان دامەزراندنی بزاڤی (PKK)، سێیەمیان قۆناخی ئیمراڵی.

لە قۆناخی ئیمراڵی چەند بەرگرینامەیەکی مێژوویی لەلایەن بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆج ئالانەوە نووسران؛ بەرگرینامەی یەکێتی دیموکراتییانە بۆ دادگای ئیمراڵی، بەرگرینامەی تایبەت بە ئورفا بۆ دادگایی ئورفا، بەرگرینامەی لە دەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانێتی دیموکراتی (دوو بەرگ) بۆ دادگای مافی

مرۆڤی ئەوروپا، بەرگرینامەی کوردی ئازاد بۆ دادگای ئەسینا، بەرگریکردن لە گەلێک بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا، ئێستاش خەریکی نووسینی بەرگرینامەی (مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتییانە)یە بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا کە لە (5) بەرگ پێکدێت.

ئەوەی لەبەردەستتاندایە (ئورفا سیمبۆلی پیرۆزی و نەفرەت) ئەو بەرگرینامەیە کە لە 2001/7/10 نووسراوە و پێشکەش بە دادگای تایبەتی شاری ئورفا کراوە. بێگومان لەبەرئەوەی بەدرەنگ کەوتنێکی (8) ساڵی، تازە ئەم بەرگرینامەیە وەردەگێڕینە سەر زمانی کوردی (کە خاڵێکی رەخنەدانە و کەموکورییەکی جددیە)، هەربۆیە هەندێک گۆڕانکاری سیاسی کە سەبارەت بە کوردستان و بزاڤی ئاپۆچی روویداوە دەبێت رەچاوبکرێت و بەشێوەیەکی بابەتیانە هەڵسەنگێنرێت بۆ نموونە؛ بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆج ئاڵان لەم پەرتووکەدا دەڵێت: "(PKK) بەم ناو و ناسنامە ناتوانێت ئەم وەرچەرخانە ئەنجامبدات" لەم چوارچێوەیەشدا لە کۆنگرەی 2002 (PKK) خۆی هەڵوەشاندەوە. بەڵام دوای سەرهەڵدانی گروپێکی تەسفییەکاری لەساڵی (2003) بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆج ئاڵان لە پەرتووکی (بەرگریکردن لەگەلێک 2004) بەشێکی تایبەتی بۆ PKK ئامادە کرد و لەژێر ناوی (رەخنەدان بەناوی PKK ، کێشەی سەرلەنوێ ئاواکردنەوە) پێشکەشکرد، بەمجۆرە داوای سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی PKKی کرد. هۆکارێکی دیکەی گرنگی ئەم گۆڕانکارییەش خودی دەوڵەتی تورک بوو، چونکە لەجیاتی هەنگاونان بۆ ئاشتی، دیالۆگ و یەکێتی ئازادانە، جارێکی دیکە درێژە بە سیاسەتی کلاسیکی دەوڵەت درا کە گەلی کورد و مافەکانی بەنەبوو دادەنێت.

ئەم بەرگرینامەیە چەندین لایەنی گرنگی کێشە هەنووکەییەکانی ئەم سەردەمەشمان دەخاتەڕوو: لەسەرووی هەمووشیانەوە پرسی ئایین. کە ئەمڕۆ لەژێر ناوی ئیسلامی سیاسی، رادیکاڵ یان میانرەو بۆتە رووژەڤ. لەلایەک سیستەمی نەمرودی جیهانی گەلان دەچەوسێننەوە و لە ئازادی و مافە سەرەکییەکانی بێبەشی کردوون. لەلایەکی دیکەش ئەو ئیسلامییەتەی گوایە دژ بەم سیستەمەیە و پێداگری لەسەر موحافەزەکاری و دۆگماتیزم دەکات ژیانی لەگەلان کردووە بە دۆزەخ و بە نیازە جیهانیش بکات بەزیندان.

لێرەدا بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆج ئاڵان لە رێگای داماڵینی ئایین لە دەمامکی ئیلاهی و پیرۆزی، لەمیانەی کۆمەڵناسییەکی هاوچەرخانەی ئازادی؛ ئەم بابەتەی لە مەسەلەیەکی تابۆ و دەست لێنەدراوی رزگارکردووە. لەم چوارچێوەیەدا تێزێکی نوێ بۆ نوژەن بوونەوەی ئایین پێشکەش دەکات؛ ئەویش ئەنجامدانی ریفۆرمێکی ریشەیی و گەڕانەوەیە بۆ رەگەکانی کەلتوور و نەریتی ئیبراهیمی، بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆج ئاڵان چۆنییەتی ئەنجامدانی ئەم هەڵمەتەی لە (7) خاڵدا پوخت کردۆتەوە. کە وەک گەڕانەوە بۆ ناوەڕۆکی ریفۆرمخوازی دەزگای پێغەمبەرایەتی دادەنێت.

خاڵی هەرە سەرنج راکێش لەم بەرگرینامەیەدا ئەو پرسەیە کە بەڕێزی سەبارەت بە PKK دەیکات و دەڵێت: ئایا PKK چ جۆرە پەیوەندییەکی بە راستینەی مێژووی و هەنووکەیی ئورفا هەیە؟ ئایا دەتوانین بڵێین PKK بزووتنەوەیەکی ئیبراهیمی هاوچەرخە؟

ئەمە و ئەم نامیلکە بە قەبارە بچووک، بەڵام بەناوەڕۆک گەورە و دەوڵەمەند، وەڵامی چەندین پرس دەداتەوە کە سەری ئێمەی جەنجاڵ کردووە.

هەروەکو گوتم هەرچەندە درەنگیش کەوتبێت، بەڵام بە وەرگێرانی ئەم بەرگرینامەیە بۆ سەر شێوە زاری سۆرانی هیوادارم خزمەتێکی بچووکم بە پەرتووکخانەی کوردی و خوێنەران بەگشتی، بە تایبەتیش بە هۆگرانی ئەم بزاڤە مەزنە و هزرە هاوچەرخەکەی کردبێت.

وەرگێڕ
2008/9/17

بۆ سەرۆکایەتی هەشتەمین دادگای سزای گرانی ئەنقەرە
دادوەرانی بەڕێز:
دوو دانە بەرگرینامەم بۆ دۆزی ئورفای تایبەت بە (PKK) ئامادە کردووە: ئەو دۆزەی نەخرابووە ناو دادگاییکرنەکەی ئیمرالی. ئەم بەرگرینامانە کە بەرتەسکترە و لە ئاستێکی خۆجێیی دایە، دەشێ وەکو پاشکۆ و تەواوکاری بەرگرینامەکانی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا هەڵسەنگێنرێن. بەرگرینامە پێشکەشکراوەکان بەدادگای مافی مرۆڤی ئەورپا، کە هەوڵمداوە لەچوارچێوەی یەکپارچەیی دۆزەکە پێشبیخەم، بۆئەوەی بەشێوەیەکی باشتر گرفت و کێشەکان روونبکرێتەوە، شیکارێکی مێژوویی و شارستانێتی لەخۆوە دەگرێت. هەربۆیە چوارچێوەی تیۆری و مێژوویی دۆزی ئورفای تایبەت بە (PKK)ش دیاری دەکات. بەشێکی تەواو بووە، ئەمانە بەیەکەوە پێشکەش دەکەم. بەشی دووەمی لەکۆتاییەکانی مانگی ئاب تەواو دەکەم و پێشکەشیان دەکەم.
لەبەرگرینامەکانمدا لە تاوتوێکردنی رووداو و بوویەرەکان زیاتر، روونکردنەوەی ئەو پەند و خاڵانەم بەبنەماگرتووە کە لەمەودوا پێی دەگەین. لەو قۆناخەی کە ئێستا تورکیا تێیدایە ریفۆرمی سیاسی و یاسایی لە رۆژەڤدایە، وەک لایەنێکی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگ، بەو بڕوایەی کە پێشکەشکردنی بۆچوونەکانم کۆمەکێکە بایەخم بەئامادەکردنی بەرگرینامەکانمدا. لە تێکۆشانێکی بەمجۆرەی کۆمارێکی دیموکراتی و سیکۆلار (عەلمانی)دا، بینینی رۆڵێکی ئەرێنیانەم وەکو تاکە چارەسەری بنەڕەتی و زانستیانە نرخاند. لەو بڕوایەشدام بەمجۆرە هەڵوێستی خۆم بەشێوەکی روون بۆ رێکخستن و گەل راگەیاند.
بەلانی کەم هیوادارم کە لەمەودوا بەرگرینامەکانم ببێتە فاکتەرێکی ئاسانکاری بۆ دادگاکەتان تاوەکو پێوانەکانی حقوقی گەردوونی بۆ وڵاتەکەی ئێمەش پەیڕەوی لێبکرێت.

2001/7/10
عەبدوڵڵا ئۆج ئاڵان
دوورگەی ئیمرالی

مێژوو لە حەوزی دیجلە ـ فوراتدا
ئورفا سیمبۆلی پیرۆزی و نەفرەت

گووتەی " مێژوو لە سۆمەرییەکانەوە دەستپێدەکات" پەیڤێکی راستە. بەڵام مێژووی سۆمەرییەکانیش لەو شوێنانەوە دەستپێدەکات کە رووبارەکانی دیجلە و فورات و لقەکانی لێ هەڵدەقوڵێت. ئەم شوێنەش میزۆپۆتامیای سەرووە. میزۆپۆتامیاش لەو دەشت و کوێستان و بەرزاییانەی نێوان زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس پێکدێت. لەسەرووی هەمووشیانەوە سۆمەرییەکان و چەندین گەلی دیکە لەو کاتەدا " مەملەکەتی بەرزاییەکان"یان بە"گوندوانا" و " کاردوانا = ئۆرارتۆ"ش ناوبردووە کە هەمان واتا دەبەخشن. دواترین لێکۆڵینەوە زانستییەکان کە لەوبارەیەوە ئەنجامدراون نیشانیدەدەن کە گونجاوترین هەلومەرجی جوگرافی لەبار بۆ شۆڕشی کشتوکاڵ وماڵیکردنی یەکەمین جۆرەکانی ئاژەڵ، لەم شوێنانە پێکهاتووە.

سەبارەت بەجۆرەکانی رووەک، دانەوێڵە و ئاژەڵی ماڵیکردن، ئەم شوێنانە خاوەن کەلتووری هەرە دەوڵەمەندە. کەشوهەواکەی خەسڵەتی ئاودێری سروشتی هەیە. ئەم شوێنە هەم لەبواری کۆکردنەوەی خواردەمەنی، هەم لەبواری نێچیروانی و بوونی بەشوێنی کۆبوونەوەی یەکەمین جۆرەکانی مرۆڤ، سەرچاوەکەی بۆ ئەم رەوشە گونجاوەی ناوچەکە دەگەڕێتەوە. یەکەمین گروپەکانی مرۆَڤ، کە شیمانە دەکرێت ملیۆن ـ ملیۆن و نیو ساڵ بەرلەئێستا لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا دەرکەوتبن، کاتێک هاتوونەتە رۆژهەڵاتی ناوین، ئەم جوگرافیایەیان وەکو گونجاوترین گۆڕەپانی ژیان بینیوە. ئەم شوێنەش پێبەپێ بووەتە جێگایەکی هەمیشەیی ژیان. لەم بارەیەوە هیچ گۆڕەپان و شوێنێکی تر وەکو ئەم جێگایە لەبار نەبووە. لەتەواوی قۆناخەکانی سەهۆڵبەندان و ماوەکانی نێوانیان، بەتاقیکردنەوە سەلمێنراوە کە ئەم جوگرافیایە لەجیهاندا گونجاوترین شوێنی ژیان بووە.

بیست هەزار ساڵ بەرلەئێستا لەگەڵ کۆتاییهاتنی دوا قۆناخەکانی سەهۆڵبەندان، چاخی میزۆلیتیک دەستپێدەکات، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو چاخی بەردینی کۆن و نوێ. لەرۆژگاری ئەمرۆماندا لە ناوچەکەدا چەندین ئاسەوار هەن کە بۆ ئەو چاخانە دەگەڕێنەوە. لە کاتێکدا (12)هەزار ساڵ بەرلە ئێستا ئەم چاخە کۆتایی هاتووە، چاخی نیولیتیک دەستپێکردووە. وەکو دەرکی پێدەکرێت وشکاییەک لەو سەردەمەدا روویداوە، ئەمەش رۆڵێکی گرنگی لەم گۆڕانکارییەدا بینیوە. بەهۆی زیادبوونی ئەزموون و ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەی بەسەر کەشوهەوادا هاتووە، لەسەر بنەمای پێگەیاندنی دانەوێڵە و رووەک و ماڵیکردنی ئاژەڵ گەورەترین شۆڕشی مرۆڤایەتی ئەنجامدەدرێت. پاشماوەی شوێنەواری ئەم شۆڕشە کۆنترین مێژووی بۆ (11)هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. پاشماوەکانی ئەم شۆڕشە لەتەواوی ئەو ناوچانە دەبینرێن کە حەوزی دیجلە ـ فورات لەگەڵ شاخەکان بەیەکتری دەگەیەنن. کۆنترین سیستەمی نیشتەجێبوون لە ناوچەی ئورفا هەڵکەوتووە. شوێنەکانی وەکو (نەوالی چۆلێ و گردی گۆبەکلی) کە دەڵێین یەکەمین شوێنەکانی نیشتەجێبوونە، مێژووەکەشی بۆ یازدە هەزار ساڵ پێش زایین درێژ دەبێتەوە. هەروەها ئەوەش سەلمێنراوە کە یەکەمین شوێنی نیشتەجێبوونی خاوەن پەرستگان.

بەقورسایی ئورفا (ئامەد و ماردین)ی ئەمرۆ و شارە دراوسێکانیان ناوەندی ئەم چاخەن. ئەو زورگ و گردۆلکانەی لەکاتی رێبوارێتی ئاسایی لە ناوچەکەدا چاوت پێیان دەکەوێت، گەنجینەیەکی مێژوویی بێهاوتان، تاوەکو ئێستا بەسەدان گردۆلکەی لەم چەشنە چاوەڕوانی کۆلین و لێکۆڵینەوەن. کاروخەباتێکی

هەستیارانەی شوێنەوارناسی لەم شوێنەدا، دەتوانێت داتاکانی یەکەمین شۆڕشی مەزنی مرۆڤایەتی بدۆزێتەوە. ئەم رەوشە بەگشتی بۆ نائاساییبوونی ناوچەکە ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ هەلومەرجی گونجاوی جوگرافی ناوچەکە دەگەڕێتەوە.

گونجاوترین رووەک و دانەوێڵە بۆ کشتوکاڵ، ئاژەڵی لەبار بۆ ماڵیکردن، هەم لەناوچە شاخاوی هەم لە دەشتەکاندا بەزۆری پەیدا دەبن. ئەشکەوتە سروشتییەکانیش لەلایەنی ئاسایشەوە گونجاوترین و یەکەمین شوێنەکانی نیشتەجێبوون بوون. لەهەموو شوێنێک زێی گەورە و لقەکانی و سەرچاوەکانی ئاو دەبینرێن. کاتێک ئەم دەرفەتانەی باران و ئاودێری لەگەڵ تواناکانی رووەک، دانەوێڵە، ئاژە ڵ و نیشتەجێبوون ببنە یەک رەوشێکی نموونەیی دێتە ئاراوە. ئەم خەسڵەتانە وایکردووە ناوچەکە ببێتە لانکەی مرۆڤایەتی. پێشکەوتنی کشتوکاڵ، ژیانی نیشتەجێی گوند لەگەڵ خۆیدا دێنێت. بەجۆرێک لە جۆرەکان شۆڕشی گوند بەرلە شۆڕشی شار ئەنجامدراوە. ئەم شۆڕشە رێگای لەبەردەم گۆڕەپانێکی مەزنی جیهانی رۆحی و زهنی مرۆڤ کردەوە.

خۆراکی زۆر، زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و پێشکەوتنی شوێنی نیشتەجێبوون، بەرچاوترین لایەنەکانی مێژووی ئەم ناوچەیەن. کەلتووری کشتوکاڵی نیولیتیک بەجۆرێک ریشەکانی خۆی داکوتاوە، تەنانەت تاکو ئێستاش کاریگەرییەکانی لەزهن و رەفتارە سەرەکییەکانی مرۆڤدا ماوە. کەلتووری دایکسالاری کشتوکاڵ ماوەیەکی درێژخایەن تێیدا ژیاوە.

و ماڵیکردنی ئاژەڵ بەشێوەکی بنەڕەتی لەدەوروبەری ژندا پێشکەوت. هەروەها ژیانی جێنشین هەرە زێدە بۆ ژن پێویستە. بەخێوکردنی منداڵ، کەلتووری کێڵگە و پەرژین، زیاتر نیشتەجێبوون دەکاتە پێویستییەک، ئەم هەلومەرجانەش رۆڵی ژن گەورەتر دەکات، کەلتووری خوداوەندە ژن پێکدێت. هێما (وێنە) یەکەمینەکانی خوداوەند پیاوانە نەبووە، بەڵکو ژنانەبووە. زمانی گفتوگۆ مێیینە بووە. یەکەمین ژنە خوداوەند ئەستێرەیان بۆ کردۆتە هێما. گووتەی " ستار " بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە. ووشەی ستار لە ئەستێرەوە وەرگیراوە. یەکەمین پەرستگای ئەم خوداوەندانەش لە گوندەکان ئاواکراوە. پاشماوەی ئەم پەرستگایانە لەشوێنە ئاسەوارییەکاندا بەرچاودەکەوێت.

ناوچەی ئورفا یەکێکە لە گەورەترین ناوەندەکانی ئەم شۆڕشە. شوێنگەی نموونەیی بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، لەساڵانی (10)هەزار پێش زایین بەملاوە کردوویەتییە ئەو شوێنەی کە بەدرێژایی ئەم چەرخە مێژووییانە رۆڵ و پێگەی لانکەی هەبێت. بەسەدان تەپۆلکە و ئەشکەوتی کەنار ئاو، بەهێزی و لەباربوونی ناوچەکە بۆ نیشتەجێبوون نیشاندەدات. سیستەمێکی بەمجۆرەی نیشتەجێبوون، لەهیچ شوێنێکی دیکەی جیهان نادۆزرێتەوە. دەتوانرێت بگوترێت ئورفا و ناوچەکانی دەوروبەری ناوەندی چاخی بەردینی نوێ (نیولیتک)ن کە (10)هەزار ساڵ بەردەوامبووە. هەروەکو چۆن ئەوروپا ناوەندی سەردەمی سەرمایەدارییە، کە ئەویش مەگەر پێنج سەد ساڵێک بەردەوامبکات. بەسەربردنی درێژترین ماوەی سەردەمی جێنشینی مرۆڤایەتی لەم ناوچەیە وایکردووە کە لەمێژووی دواتردا ئاسەوارەکانی دیاربێت و نەسڕدرێتەوە. مێژووی سۆمەر و میسر بەردەوامییەکی سروشتیانەی مێژووی ئەم ناوچەیەن. دوای ئەوەی مرۆڤ لەم ناوچانە نیشتەجێبوو، هێزی کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، تەکنیک (ئامراز)، زانست، ئایدیۆلۆژی و بەڕێوەبەرایەتی تاقیکردەوە، ئینجا بەرەو خوارتر بۆ زەوییە لیتاویی و بەپیتەکان و کەناری ئاوەکان شۆڕبوونەتەوە. شوێنەوارە مێژووییەکان ئاشکرای دەکەن کە ئەو کەلتوورەی بۆ سۆمەر و میسر چووە لەم ناوچانەوە سەرچاوەی گرتووە. بەهەرحاڵ شۆڕشی کشتوکاڵ نابێت لە بیابانەکانی ئەفریقیا و عەرەبستان سەرهەڵبدات. هەروەها بۆ دەستپێکردنی یەکەمین شوێنەکانی نیشتەجێبوون لەکەناری رووبار و زۆنگاوەکان (هۆرەکان)دا کەلتووری دانەوێڵە و رووەک و ئاژەڵداری جێگای باس نەبوو. ئەم راستینەیەش ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، بۆچی سەردەمی دەستپێکردنی مێژوو لە حەوزی دیجلە ـ فورات، بەتایبەتیش لەناوچەکانی ئورفا و دەوروبەری بووە.

دیسان پێویستە جەختی لەسەر بکرێتەوە، ئەم چاخە؛ چاخی کشتوکاڵ، ماڵیکردنی ئاژەڵ، دارچاندن، ئاواکردنی گوند، دروستکردنی پەرستگا و جێگیرکردنی یەکەمین هێمای خوداوەندی ئاسمان بووە. ئەو چاخە بووە گەواهی کۆمەڵگای دایکسالاری دەوروبەری ژن و لەدایکبوونی هێزی کەلتووری ژن. کاریگەری ئەم چاخە لەسەر مرۆڤایەتی تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان ماوە. کەلتووری دایکایەتی، ئاژەڵداری و کشتوکاڵ لەکوێ و چەندە بەکاریگەری بێت، مۆری رەسەنی شوێنی سەرهەڵدانی ئەو چاخە لەخۆوە دەگرێت. ئەم یەکەمین شۆڕشەی مێژوو شەپۆل بەشەپۆل لەهەموو شوێنێک بڵاوبۆتەوە و شوێنپەنجەی خۆی لەسەر بەجێهێشتووە.

ئۆرفا وەکو ناوچە مەڵبەندی ئەو سەردەمە بوو، پێویست دەکات هەندێک زاراوەی وەکو مێژوو، پیرۆزی و نەفرەت بەقووڵی روونبکرێنەوە و بناسرێن و شیبکرێنەوە، لەبەرئەنجامی ئەوەشدا دەگەینە ئەو رۆشنگەرییە زهنییەی کە پێویستە ببێتە بناخەی رێنسانسی رۆژهەڵاتی ناوین. هەروەکو ئاماژەمان پێکرد مێژوو بەسۆمەر و میسر دەستپێدەکات، بەڵام میسر و سۆمەریش دوای شۆڕشی کشتوکاڵی ئەم جوگرافیایە دەستپێدەکەن. تەنانەت دوای ئاوابوونی ناوەندەکانی شارستانێتیش، وەکو یەکەمین هێماکانی شارستانێتی رێگا و کاروانەکان لەنێوان ئەم ناوچەیە و ناوەندەکانی شار دەکەوێتە کار. تەواوی ئەو تەکنیک (ئامراز) و هزرانەی کە رێگایان لەپێش شارستانێتی کردەوە، لەسەر ئەم رێگایانەوە بەرەو سۆمەر و میسر، دواتریش هەنگاو بەهەنگاو بەرەو باکوور، رۆژهەڵات و رۆژئاوا

رۆیشتووە و بڵاوبۆتەوە. تەواوی بەڵگە مێژووییەکان نیشانیدەدەن ئەگەر نزیکەی (10)هەزار ساڵ پێش زایین بەبنەما بگرین، ئەوا ماوەی نێوان هەزار - دوو هەزار ساڵ لەم ناوچەیەوە بۆ هەرچوارلا پەلهاوێشتن و نیشتەجێبوون جێگای باسە. شەش هەزار ساڵ پێش زایین چاخی کشتوکاڵ بەباشترین شێوە پێگەیشت و بەدەزگا بوو، ئەمەش بەکەلتووری (تل - حلف) ناوبرا. نزیکەی دوو هەزار ساڵ دوای ئەم قۆناخە یەکەمین سەرەداوەکانی شارستانێتی سۆمەر و میسر بەدەرکەوتن. لەساڵانی (3 - 4)هەزاری پێش زایین سۆمەر، دواتریش میسر لەدایک بوون. سەرجەم کەلتوور و بەهاکانی شارستانێتی لەکەوانەی ناوەوەی سیستەمی زنجیرە چیای (زاگرۆس - تورۆس)ی میزۆپۆتامیای سەروو بۆ ئەوێ دەگوازرێتەوە.

نزیکەی ماوەی (1000) ساڵ دوای بڵندبوونی شۆڕشی شار و شارستانێتی(3000ی پ.ز) سۆمەر، یەکەمین کۆلۆنیەکانی خۆیان لە میزۆپۆتامیای خوارووەوە بەرەو "مەملەکەتی بەرزاییەکان" بڵاوکردەوە.(ئورفا، حەڕان، کارگامێش و سامسات) بەیەکەمین ناوەندە گرنگەکانی کۆلۆنی مێژوویی ناسراون. خودی ئورفا جوگرافیاکەی پڕە لە تەپۆلکە و دەکەوێتە کەناری رووبارەوە. دەریاچەی (خەلیل رەحمان) لەم سەرچاوەیەوە دێت. ئاو و رەحمەت بەهەمان واتا دێن، هاوواتابوونی نێوانیان جێگای باسە. بەمجۆرە دەربازبوون لەچاخی گوندەوە بۆ چاخی شار دەستپێدەکات. هەربۆیە سەردەمی مێژووی نووسراوی ئورفا و دەوروبەری، لەساڵانی (2000)ی پێش زایینەوە دەستپێدەکات. لەمەبەدواوە بەسانایی دەتوانرێت مێژوو پۆلێنبەند بکرێت؛ واتە بەگوێرەی بەشەکانی (کات = زەمان) دەستنیشانبکرێت. ئیتر بەشێوەیەکی ساناتر دەتوانرێت روونبکرێتەوە کەهەر سەردەمێک گوزارشت لەچیدەکات.

مێژوو لەسەرەتایی خۆیدا شاراوەیە. ئەوانەی سەرەتاکەی شێکارنەکەن، زانیاری مێژووییان، واتە نەزانی (جەهالەت)یان دەبێتە بناخەی گشت کارەساتەکان. بۆ مرۆڤایەتی رەوشێکی وەها سانایی نییە کە لانکەکەی پشتگوێ بخرێت. کام مرۆڤ دەتوانێت بڵێت من لەلانکەدا گەورە نەبوومە؟ ئەگەر بڵێین نەخێر، ئەو کاتە تاوەکو رۆڵی لانک (بێشک)ە دەرکی پێنەکرێت و مافی خۆی پێنەدرێت، ئەوا بەها و راستی مرۆڤایەتیش دەرکی پێناکرێت. دایکێک بەهەزارن ساڵ تۆ لە بێشکەکەی خۆیدا مەزن بکات، دوایی تۆ بڵێی " ئەوە رابردووی من نییە، من بەهایەکی کۆمەڵگای چینایەتی شارەکانم، تەنیا ئەمە من پەیوەندیدار دەکات"! ئەو کات ئەوەیان مێژووی مرۆڤایەتی نییە، بەڵکو دەبێتە مێژووی چینایەتی. سەردەمی بێشکە تەنیا قۆناخی گریان و داواکردنی شیرنییە، قۆناخی سەرەتای ئاشنابوونە لەگەڵ زمان، هزر، رۆیشتن، ناسینی سروشت و کۆمەڵگا. قۆناخێکە بەهەموو بێگەردی خۆیەوە، بەبێ سەرکوتکردن و چەوسانەوە، بەبێ پەنابردنە بەردزی، ژیان تەنیا لەمیانەی پشتبەستن بەرەنجەوە ناسراوە و گەشەیکردووە. لە جوگرافیاکەماندا مێژوو بەمجۆرە دەستی پێکردووە و مسۆگەر ئەمەش ناوەرۆکەکەیەتی.

کەواتە لە بێشکەی خۆمانەوە دەستپێکردنی بارکردنی مرۆڤایەتی بەبەها سەرەکییەکانەوە راستە و لەجێگای خۆیدایە. "مسۆگەر پێویستە هیچ گومانێکمان لەوەدا نەبێت کە بناخەکانی مرۆڤایەتی لای ئێمەیە، لەم لایەنەوە دەبێت بڕوامان پتەوبێت". مێژووی چینەکان دواتر نووسراوە: ئەم مێژووەش بەناوی، کەس، خانەدان(بنەماڵە) و ناسنامە خودایی (ئیلاهی)یەکان نووسراون. ئەم مێژووە لەجیاتی راستییەکان درۆ رووبەر و پانتاییەکی داپۆشیوە. بڕوا پێنەکردنی رێزگرتنە لەبەرامبەر مێژووی راستەقینە. کاتێک ئورفا و مێژوو لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکرێن، ئەم راستی و ناکۆکییە بەزەقی دەبینرێت و ئاگادارمان دەکاتەوە، کە تاوەکو ئێستا لەدوروبەری ئورفا بەم دوو شێوازە مێژوو دەخوڵقێت (دەنووسرێت): ئەو مێژووەی مرۆڤە راستین(رەسەن)ەکان بەرەنجی خۆیان خوڵقاندوویانە، لەگەڵ ئەو مێژووەی کە کەسانێک دێن لەرێگای فشار، هەزارویەک فرت و فێڵ، درۆ و تەڵەکەبازییەوە دەستی بەسەردا دەگرن. لەبەرئەوەشە ئەم ناوچەیە هەرمزێدە بەهۆی ئەم مێژووەوە نەیتوانیوە مێشک و هزری خۆی بکاتەوە. چونکە لەگەڵ کۆمەڵگای چینایەتیدا مێشکی بووە بەخۆڵەمێش و گەچ گرتوویەتی. کەواتە تاوەکو ئەمە بەشێوەیەکی راست شیکار نەکرێت، ناتوانین کردەی بیرۆکەیەکی راست پەیڕەو بکەین.

کاتێک باسی ئورفا دەکرێت زاراوەیەکی دیکەی سەرەکی کە پێویستی بەشیکارکردن هەیە، "پیرۆزی"یە. پیرۆزی چییە؟ پەیوەندی لەگەڵ ئەم ناوچەیە چۆن سەریهەڵداوە؟ دیسان سەرچاوەکەمان سۆمەرە. ئەم ووشەیە لە زمانی سۆمەریدا " کاوتا" ی پێدەڵێن، کە بە واتای "خۆراک" دێت. خۆراک (خواردەمەنی) هەموو شتێکی سوودمەندە کەلە رێگای ئاژەڵداری و کشتوکاڵەوە بەدەستدێت. خۆراک لەژیانی سەرەتایی مرۆڤدا وەکو ئەفسون (جادوو) پێشوازی لێکراوە. چونکە مرۆڤایەتی لەرێگای خواردنەوە درێژەی بەژیان داوە. بەگوێرەی ئەوەی هیچ شتێک وەکو ژیان بەهادار نییە، ئەوا هیچ شتێکیش وەکو خۆراک بەهادار نابێت، کە فاکتەرێکی درێژە پێدەری ژیانە. هەر شتێک بەواتای بەهایەکی مەزن بێت بۆ تەواوی مرۆڤایەتی شکۆدار دەکرێت، دەکرێتە تابۆ، ئیلاهی و پیرۆز دەبینرێت. پیرۆزی ئەو ناسنامەیەیە کە شایستەی شتە گرنگەکانی درێژە پێدەری ژیانی مرۆڤایەتی دەبینرێت. بەگوێرەی ئەوەی لەدرێژەدان و بەردەوامکردنی ژیانی مرۆڤایەتی خۆراک بەهادارترین شتە، ئەوا بوونی بەشتێکی پیرۆز مەسەلەیەکە دەرکی پێدەکرێت. لێرەشدا پێشەنگەکانی سۆمەر زۆر بەچاکی بوویەرەکەیان دەستنیشان کردووە و ناویان لێناوە.

لە ئورفا و دەوروبەری پیرۆزی سۆزێکی بەربڵاوە. هەر لایەک پڕە لە پیرۆزی. ئەم مەسەلەیەش بەو واتایە دێت: لەهەر لایەکی ناوچەکەدا خۆراک فیچقە دەکات و هەموو شوێنێک سەوزاییە. بەجۆرێک لەجۆرەکان مێژووی خۆراک لەو ناوچەیە شاراوەیە. بەڵام چەندە شاراوەش بێت، بەهۆی بایەخەکەیەوە بەردەوام ئاسەوار و شوێنپەنجەکەی لەیادەوەرییەکانی کۆمەڵگادا دەمێنێت و ناسڕێتەوە، ئەمەش هەرشەیەکی شاراوەیە. مێژووی خۆراک گەوهەری زاراوەی ئورفای پیرۆزە. نەک تەنیا خەڵکی ناوچەکە بەڵکو تەواوی مرۆڤایەتی لەمیانەی ئەم خۆراکەوە ژیاوە. تەنانەت تاوەکو ئێستاش لەو رێگایەوە دەژی. ساوار، جۆ، نۆک، نیسک، ترێ، هەنجیر و ... هتد. تەنانەت لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا کێ دەتوانێت دەستبەرداریان بێت؟ ئەوەی سۆمەریەکان هاوتای پیرۆزییان بینیوە، بەبەروبوومی خوداییان داناوە و مەراسیمی جەژنیان بۆ کردووە ئەم خۆراکانەیە. ئەمەش مێژووی شاراوەی خۆیانە.

لەبناخەی خۆراکدا چی هەیە؟ رەنج هەیە، رەنجی دایک هەیە. خولقێنەر و دۆزەرەوە و پێگەیەنەرەکەی دایکە. کێ دەزانێت کاتێک یەکەمین گوڵەگەنمەکانی کۆکردۆتەوە چەندە دڵخۆش بووە! ئەی چۆن دڵخۆش نەبێت؟ مرۆڤایەتی تەنها لەرێگای ئەو بەرهەمانەوە بەردەوامی بەهەبوون و رەچەڵەکی خۆی دەدات، ئایا کاروچالاکییەکی لەمە واتادارتر دەبێت؟ ئایا دەشێت لێرەدا شەڕ و ئەشکەنجە بوونی هەبێت؟ ئەو خەریکی بەرهەمهێنانە. تەنیا ئەمە دەزانێت و دەناسێت. لەو رێگایەوە درێژە بەژیانی مرۆڤایەتی دەدات. بەمجۆرەش لەمرۆڤایەتی تێدەگات. مرۆڤایەتی دایک، مرۆڤایەتی ژن بەم واتایە دێت. ئەمە چەمکێکی ناسینی مرۆڤایەتییە کە بەواتای مرۆڤایەتی پیرۆزیش دێت. سۆمەرییەکان راستی هەڵدەسەنگێنن. ئەو ئامرازە گرنگانەی لە بەرهەمهێنانی خۆراکدا بەکاردەهێنرێن بەپیرۆز دادەنرێن. خەرماشە، گاسن، تەور، گا، گامێش و... هتد. تەنانەت هەریەکە و خوداوەندی تایبەتی خۆی هەیە. تەواوی جۆرەکانی خۆراک و سەرجەم ئەو شتانەی لەبەرهەمهێنانی خۆراکدا سوود بەخشە وەکو خاک، باران، خۆر، با و ئاژەڵەکان یان خۆیان دەکرێن بەخوداوەند یان لەرێگای خوداوەندێکەوە نوێنەرایەتییان دەکرێت.

زاراوەی پیرۆزی هێندەی دەچێت فراوان و ماناداریش دەبێت، چونکە مرۆڤایەتی لەمیانەی چۆنیەتی رێگا و رێچکەو پەیڕەوەکانی پێگەیاندنی ئەم خۆراکانە گەورە دەکرێت، پەرەی پێدەدرێت و بەردەوامدەبێت. لەو جۆرەی دوێنێ کەلەئاژە ڵ دەچوو لەسەرنێچیر و کۆکردنەوەی خواردەمەنی دەژیا گوزارکردن و گۆڕان بۆ مرۆڤێکی بەرهەمهێنەر سانایی نییە. ئەمە شۆڕشێکی ئاوارتە و ئەفسونییە. ئەم راستییە پیرۆز دەبینرێت و دەکرێت بەئیلاهی. کەواتە خۆراک لەبناخەی خوداوەندیبووندا شاراوەیە کە لەگەڵ پیرۆزی هەمان واتای هەیە. خوداوەندەکانی خۆراک (خواردەمەنی) بەهۆی سوودەکانیانەوە، ئەو خوداوەندانەن کە مرۆڤ

ناسنامەی پێبەخشیون. وەکو دۆستی خۆی نزیکترین ناسنامەن لێیانەوە. هێشتا سەردەمی ئەو خوداوەندە ژنانەیە کە مرۆڤ ناچەوسێننەوە، هەمیشە بۆیان دەبنە خۆراک و خۆیان پێشکەش دەکەن، سەردەمی ئەو خوداوەندانەیە کە منداڵ (وەچە)دەخەنەوە و بەخێویان دەکەن. پیرۆزی بۆ ئەم خوداوەندانە تایبەت دەکرێت. واتە پیرۆزی پێشکەش بەراستینەی سەرەکیترین خۆراک دەکرێت. ئەم خوداوەندانە درۆ و فشار پەیڕەو ناکەن. دایکی ئەم خوداوەندانەش دایکە خوداوەندە. راستینە و مێژووی خوداوەندەکان بەمجۆرەیە. زۆر روونە: وەک خوداوەندێکی پیرۆز واتار دەبن، دەبنە ناسنامەی پیرۆزیی خۆراک کە رەنجی مرۆڤ بناخەکەی پێکدێنێت و پێویستییەکی ژیانییە. لەبەرئەوە دەوروبەری ئورفا پڕە لەم پیرۆزییانە، کەواتە پڕە لەشتە ئیلاهییەکان. خودی ئورفاش بەوشێوەیە پیرۆزدەبێت.

دواتر سۆمەرییەکان ئەم خوداوەندەیان زەوتکرد. لەپەرستگای راهیبەکاندا کران بەخوداوەندی کۆمەڵگای چینایەتی. بۆ ئاسمان بەرزیان کردەوە، خستیانە رەوشێکەوە کە دەرکی پێنەکرێت. کردیانە خوداوەندێک کە لێدەدات، سزا دەدات و تۆفان دەبارێنێت. ئەمانە خودی چین (گبقە)ن کە بەرزبوونەتەوە، خۆیان کردووە بەخوداوەند. ئەمەش یەکەمین دەستدرێژی و داگیرکاری هەرە گەورەیە کە دەکرێتە سەر مێژوو و هۆشیاری مرۆڤایەتی. سەرەتای هۆنینەوەی تۆڕی درۆ، فشار و قەدەری خراپە. کەچی خوداوەندەکانی دایکە خوداوەندیش لە تەنیشتیانەوە (لەتەک مرۆڤەوە) بوون. بەرهەمهێنەر و دۆست بوون، بەهیچ شێوەیەک فشار و درۆیان نەدەزانی. بەمجۆرە لەپەرستگای راهیبەکان بەتایبەتیش بەشێوەیەکی نووسراو خوداوەندە درۆزن و سزادەرەکان بەرهەمهێنران و بۆ ئاسمان بەرزکرانەوە، دواتریش چەندەی بلێی مەزن و شکۆدارکران. زیادەڕۆیی بۆ کرا، لەڕادەبەدەر زلکران و نۆوەدونۆ سیفەتیان لێبارکرا. بەمجۆرە چینی دەسەڵاتدار بەبێ ئەوەی کاربکەن، گەورە بوون، بوونە سزادەر، چەوسێنەر، رەنج و بەرهەمی خەڵکیان زەوتکرد و لەگەڵ دارودەستەکانیاندا بوونە خوداوەند. راهیبەکانی سۆمەر ئەم کارەیان بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا ئەنجامدا، واتە بۆ ئەوەی بزانین ئەمەبوو ئەو کارەی ئەنجامیاندا، بەبێ گەڕانەوە بۆ فەلسەفە و زانست کە سەر لە مرۆڤ دەشێوێنێت لێی تێدەگەین، میتۆلۆژیا (ئەفسانە)یان وەکو چیرۆک دروستکرد و بەکاریان هێنا. دواتر کاتێک وەکو چینی دەسەڵاتدار خۆیان جێگیرکرد، گووتیان " جیهان هی منە" خوداکانیشیان بەپلە و ئادرەسی " لەئەزەلەوە هاتووین، بۆ ئەبەدی و هەمیشەیی دەڕۆین"گەیاند. چونکە دەسەڵاتدارەکان راستینەی هەرە گەورە و مسۆگەرن! هەروەکو چۆن خوداکانیان مسۆگەرن و گەورەترین راستین، ئەوانیش بەمجۆرە خۆیان دەنوێنن و خۆیان بەسەر کۆیلەکاندا دەسەپێنن.

حەزرەتی ئیبراهیم بەکەسێکی خەڵکی ئورفا دەناسرێت، هەڵوێستی بەرامبەر ئەم زۆرداری و درۆ گەورەیە واتادارە و پیرۆزییەکی راستەقینە لەخۆوە دەگرێت. حەزرەتی ئیبراهیم دەڵێت:" ناشێت ئەم بتانە خوداوەندبن، تەنانەت بتی هەرە گەورەشیان نابێتە خوداوەند ". کاتێک نەمرود دەڵێت: " نا". ئەویش دەڵێت:" کەواتە من بتەکانم نەشکاند، بەڵکو بتە گەورەکە شکاندی" بەمجۆرە (نەمرود) دەخاتە نێو تەڵەزگەوە. ئەمە شەڕێکی ئایدیۆلۆژییە. لێرەدا شەڕ لەنێوان سیستەمی خوداوەندی گەل و سیستەمی خوداوەندی چینی کۆیلەدار ـ نەمرودەکان جێگای باسە. تاکە خودای حەزرەتی ئیبراهیم گوزارشت لە هەبوون و یەکێتی گەل، راستتر گوزارشت لەهەبوون و یەکبوونی تیرەکان دەکات. رزگاربوون لە بتگەرایی هەڵوێستێکە لەبەرامبەر هێزی درۆی زەق و ئاشکرا. خوداوەندێکی (ئەبستراکت ـ مجرد) مەعنەوی و گشتگیر، کە بۆ ئەو سەردەمە جێگای تێفکراندنێکی زۆرە، هۆکاری یەکبوون و بەرەو پێش چوونە. بەمجۆرە پیرۆزی حاڵەتێکی ناراستەوخۆ لەخۆوە دەگرێت. گۆڕەپانی پیرۆزیی تایبەت بۆ " ئەڵڵا" سنووردار دەکرێت، بەڵام دیسان هێز و یەکێتی گەل لەبناخەکەیدا هەیە. دووەمین قۆناخی پیرۆزییەکانی ئورفا، هەڵمەتی نیشاندانی هەڵوێست بوو لەبەرامبەر خوداوەندی چینایەتی، کە بەپیرۆزی ئیبراهیمی و پێغەمبەرایەتی ناو دەبرێت. بەگوێرەی قۆناخی خۆی پیرۆزییەکی بەرخودانگەر و پێشکەوتنخوازە.

ئەمە لەشەڕی نێوان خوداوەندەکاندا دەبێتە هەڵوێستێکی نزیک بەڕاستی. بەناوکردنی ئورفا وەکو شاری پێغەمبەران، کە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەمجۆرەیە، بۆ پیرۆزی خۆراک و ڕەنجەکەی، بەتایبەتیش بۆ ناوهێنانی بەووشەی پیرۆز دەگەڕێتەوە. کاتێک دەگوترێت ئورفای پیرۆز، شاری پێغەمبەران، بەواتای ئەو ئورفایە دێت کە بەسیستەمی کشتوکاڵ و خۆراکەوە گرێدراوە. ناونانیشی بەناسنامەی شاری پێغەمبەران بۆ ئەو ڕاستییە دەگەڕێتەوە. کاتێک لەلایەن خوداوەندە درۆزنەکانی چینایەتییەوە، هێرش کرایە سەر پیرۆزییەکانی ناوەندی ئەو پێغەمبەر و مرۆڤانەی کە نوێنەرایەتی سیستەمی خودایی گەل دەکەن، ئەوانیش لە بەرامبەر سیستەمی خوداوەندی نەمرود ڕاپەڕیون.

لەکاتێکدا مێژوو و پیرۆزی لەناوچەی ئورفا بەمجۆرە بێت، ئایا زاراوە گرنگەکەی دیکە نەفرەت (نەعلەت) بەچ واتایەک دێت؟ زاراوەیەکی دیکەی (کلیل)یش خودی نەفرەتە. شیکارکردنی ئورفا لەنزیکەوە پەیوەندی بەشیکردنەوەی نەفرەتەوە هەیە.

هەرشتێک مێژووی ڕاست و پیرۆزی تێکبدات نەفرەتە. نەفرەت هێرشێکی ستەمکار و درۆزنەکانە. شانبەشانی هێرشی دز و ستەمکاران بۆ سەر ڕەنج و ڕەنجدەران، قۆناخی نەفرەتکردن دەستپێدەکات. تەواوی کردەوەکانی پەلاماردان بۆ سەر گشت بەرهەمەکانی ڕەنج، گوند، شار، کێڵگە و پەرستگاکان بەلەعنەت ناودەبرێت. ئەم ڕەوشە لەنزیکەوە پەیوەندی بەپەڕینەوە بۆ کۆمەڵگای چینایەتییەوە هەیە. مرۆڤایەتی لەمیانەی ئەم سیفەتە (نەفرەت)وە وەڵامی ئەو داگیرکردن، سزادان، تاڵان، وێرانکردن، تەڵەکەبازی و زۆردارییە دەداتەوە کە تا ئەو کاتە ئاشنای نەبوو. ئاشکرایە کە نەفرەت گوزارشت لەپێچەوانەی پیرۆزی دەکات. لەگەڵ بەرزبوونەوەی کۆمەڵگای چینایەتی لە شاری ئورفا و دەوروبەری (نەفرەت)یش بەخێرایی زیاد دەکات، چونکە هێندەی دەچێت بەرهەمەکانی ڕەنج زیاد دەبێت و دەوڵەمەندی پەرەدەسێنێت. لەحاڵەتێکی وەهادا جیابوونەوەی چینایەتی و هێرشکردن لەناویەکدا بەڕێوە دەچێت. چیتر ئەم ناوچانە ناتوانێت خۆی لەژێر دەستی هێرش، داگیرکاری و تاڵانکاران ڕزگاربکات. نەفرەت تۆڕی خۆی بەسەردا دەکێشێت. تراژیدیا جێگای مەراسیمی پیرۆزی و جەژن دەگرێتەوە. جەژنەکانی پیرۆزی تێکدەچێت، قۆناخی تراژیدیا و شیوەن دەست پێدەکات کە نەفرەت ڕێگای لەبەردەم کردۆتەوە.

پێشتر مۆسیقای ئایینی و زایەڵەکانی پیرۆزی لە ئورفا و دەوروبەری جێگای باس بوو، تەنانەت ئەگەر بگوترێت یەکەمین ناوەندی مۆسیقای ئایینی جیهانە لەجێگای خۆیدایە. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەمجۆرە بەردەوامبووە، بەڵام کاتێک سەردەمی نەفرەت دەستی پێکرد، ئەم مۆسیقایە جێگای خۆی بۆ داستان، هاوار و شیوەن بەجێهێشت. ئەو سەردەمە دەستپێکرد کە بەگۆرانییەکانی ئورفا دەناسرێت. مۆسیقای پیرۆزی لەناو ئەم گۆرانیانە شاراوەیە. شۆڕشی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لەژێر ئەم پیرۆزییەدا شاراوەیە کە لەنێو متمانە و خۆراکی زۆردا، دەرفەتی بەردەوامبوونی ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی ڕەخساند. لە کەلتووری بنچینەیی ئورفا مۆسیقا بناخەیەکی بەمجۆری هەیە. کاتێک مرۆڤ هێزی خۆراکی جێگیر بەدەستدێنێت دڵخۆش دەبێت، ئەم دڵخۆشییە دەبێتە دەنگ و گۆرانی لەدایک دەبێت. سەرەتا مۆسیقا بۆ پیرۆزی خوداوەندەکان دادەنێت، دواتر بەسەردولکە و ئاوازی خەمناک وەڵامی نەفرەت دەداتەوە. بەمجۆرە گۆرانییە خەمناکەکان دەکەوێتە ناو دیرۆکی سترانەوە.

گرێدراو بەم زاراوە سەرەکیانە (پیرۆزی ـ نەفرەت) دەتوانرێت چەندین چەمکی دیکەی کەلتووری وەکو: ڕەحمەت، زیارەت، سەبر، کفر، دوعا، قارەمان، عیبادەت، جەژن، خزمایەتی، شەیتان و پەرستگا... هتد بژمێردرێت. کەلتووری شۆڕشی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری قووڵە؛ لەتەواوی کیشوەر و سەردەمەکاندا کاریگەری لەسەر مرۆڤایەتی کردووە.

هەروەکو دەزانین سۆمەرییەکان بەگەلی خولقێنەری ئەم سەردەمەیان گوتووە" ئاریانییەکان" کە بەواتای گاسنەوانی دێت، "ئۆرارتوو" بەواتای " خەڵکی مەملەکەتی بەرزاییەکان" دێت، " گۆتــی" بەواتای ئەو کەسانە دێت کە لەگەڵ گا، مانگا و رەشەوڵاخەکانیاندا دەگەڕێن. تەواوی ئەم زاراوانە ریشەکەیان بۆ سۆمەرییەکان دەگەڕێتەوە و گوزارشت لەخەڵکی میزۆپۆتامیای سەروو دەکەن. لەمێژوودا ئەم کەلتوورە بە (هیندۆ ئەورووپی)، بەواتایەکی بەرتەسککراوتر بە"کەلتووری ئاریان" ناو دەبرێت. ئەم کەلتوورە تاوەکو ساڵانی چوارهەزاری پێش زایین، لەکەنارەکانی زەریای مەزن، لەچینەوە تاوەکو زەریای ئەتڵەسی، تاوەکو دەگاتە دوا سنوورەکانی ئەورووپا بەهێزی پەلهاویشتن و بڵاوبوونەوە گەیشتووە.

لەمیانەی هەڵکۆڵینە شوێنەوارناسییەکانەوە رۆژ لەدوای رۆژ راستینەی بۆچوونێکی هاوبەش دەخاتەڕوو کە ئەمجۆرە پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوە کەلتوورییەی ئاریان لەیەک ناوەندەوە سەرچاوەی گرتووە. لەهەمان لێکۆڵینەوەدا دەبینرێت کە مێژووی شار و جیابوونەوەی چینایەتی بەپشتبەستن بەسەرچاوە سۆمەرییەکان لەساڵی (2،000)ی پێش زایینەوە کاریگەرییەکانی دەبینرێت. دوای ئەوە سەردەمی مێژووی نووسراو دەستپێدەکات، بەڵام راستترین و قووڵترین مێژوو، چاخی کشتوکاڵییە کە زیاتر لە (10،000) ساڵ ناوەندێتی کرد، پێش ئەو چاخەش بەدەیان هەزارساڵ، چاخی کۆکردنەوەی بەرووبوومی درەخت (خواردەمەنی)، چاخی هەرە پێشکەوتوو بووە. بەگوێرەی ئەمە مێژووی نووسراو هەم نوێیە، هەم بەخەستی دیرۆکی چینایەتی لەخۆوە دەگرێت. ئەمە مێژوویەکە تارادەیەکی مەزن راستییەکانی شێواندووە، هەڵکشانی سیاسی و ئایدیۆلۆژی دەسەڵاتدارانی پیرۆزکردووە، جۆرێکە لەمێژووی نەفرەت کە راستی مێژوو و پیرۆزی تێکداوە.

لەساڵانی (2000)ی پێش زایین ئاشوورییە بەرەچەڵەک ئامووررییەکان کە دەکەونە باکووری بابل، وەک قەومێکی بازرگانی میزۆپۆتامیای سەروو بۆ ئەنادۆڵ هەڵدەکشێن. لەنێوان میزۆپۆتامیای خوارووی کە سیستەمی شاری تێدا زاڵبوو، لەگەڵ میزۆپۆتامیای سەرووی ئەنادۆڵ کە سیستەمی کشتوکاڵ و کانزا (مەعدەن)گەری تێدا پێشکەوت، ئاشوورییەکان لەڕێگەی بازرگانییەوە هێزێکی زۆریان بەدەستخست. لەساڵانی (1300)ی پێش زایین تا کۆتاییەکانی (600)ی پێش زایین ئاشوورییەکان هێزی دەسەڵاتداری سیاسی و بازرگانی بوون.

ئورفا لەمیانەی بوون بەناوەندی ئەم کشتوکاڵ و بازرگانییە گرنگی زیاتر بەدەست دەخات. لەسەردەمی (هۆری)یە کشتوکاڵکار و کانزاگەرە بەرەچەڵەک ئاریانییەکان، دواتریش لەقۆناخی میتانییەکان کە بەردەوامێکی (هۆری)یەکان بوون، ئورفا ناوە بەناوە رۆڵی پایتەخت دەبینێت. لەنێوان (ئاشووری و هۆری)یەکاندا دەستدەگۆڕێت، هەروەها دەبێتە ناوەندی هەرە گرنگی میتانییەکانیش. لەسەردەمی ئۆرارتوورییەکانیشدا ئەم گرنگییەی خۆی بەردەوامدەکات. لەم سەردەمانەدا بەردەوام لەنێوان (هۆری - ئاشوری - هیتیتی)یەکاندا دەبێتە ناوەندێکی پەلاماردان و خێرا خێرا دەسگۆڕکێ دەکات. لەدوای (میدی)یەکان دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی (پارس)ەکانەوە. لەسەردەمی (ئەسکەندەر) ئاشنای (هێلینی)یەکان دەبێت. لەساڵانی (100)ی پێش زایین دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی رۆماوە. دیسان لەم سەردەمە دەبێتە ناوەندی دەوڵەتی (ئەبگار) کە بەرەچەڵەک (ئاریانی - ئاشوری)ین. لەسەردەمی (بێزەنتی)یەکانیش کە شوێنی رۆمایان گرتۆتەوە، لەکاتی شەڕ و پێکدادانەکانی نێوان (ساسانی - بێزەنتی)یەکان دەست گۆڕین بەردەوام دەبێت. هەروەها ئورفا لەسەرووی ئەو شوێنانەوە دێت کە ئایینی مەسیحی تێدا لەناو (کورد - ئاشوری - ئەرمەن)ییەکاندا بڵاوبۆتەوە.

پێشتر جەختمان لەسەر ئەوە کردبۆوە کە لەساڵانی (1800)ی پێش زایین ئورفا ناوەندی ئەو بزووتنەوانەبوو کە پێغەمبەرەکان رێبەرایەتییان دەکرد. بەتایبەتی نەریتی پێغەمبەری کە نوێنەرایەتی بەرخودانی تیرە خۆجێییەکان دەکات بەرامبەر پادشا - نەمروودە بەرەچەڵەک ئاشوورییەکان، لەڕێگای حەزرەتی

ئیبراهیمەوە قۆناخێکی مێژوویی دەستپێدەکات. ئەمە لەناوەرۆکی خۆیدا نەریتی بەرگریکردنە لە ئازادی و بەرخودانی ئەو گەل ـ تیرانەی بەرامبەر سیستەمی کۆیلەداری نوێنەرایەتی ئەم نەریتە دەکەن. وەرچەرخانی ئایدیۆلۆژی لە تەوتەمپەرستی تیرەوە بەرەو یەکتاپەرستی، لەمیانەی ئایینە تاکخوداییەکانەوە گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینی. بەشێوەیەکی بنەڕەتی پێغەمبەرەکان خوڵقێنەر و نوێنەری گۆڕانکاری ئەم قۆناخە مێژووییانەن. بەشێوەیەکی ڕێژەیی ئەم هەنگاوە لایەنێکی ئازادیخوازیشی هەیە. دەرکەوتنیان کاردانەوەیەکە لەبەرامبەر جیابوونەوە و سەرهەڵدانی چینایەتی. لەشێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی قۆناخی ناوینی نێوان ڕێکخستنی دەوڵەت و بەڕێوەبەرایەتی پەرتەوازەی تیرە شاخاوییەکان ڕۆڵێکی سەرەکیان دەبێت. ئەم نەریتە کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر پەیدابوونی هێزە نوێکان هەیە. ئاوابوونی پادشایەتی (عیبرانی)یەکان لەساڵانی (1000)ی پێش زایین بەرئەنجامێکی ئەم کاریگەرییە. ئەم نەریتە کە لەڕێگای تەوراتەوە بوو بە یەکەمین پەرتووکی پیرۆز، دواتر وەکو "عەهدولقەدیم" تا بڵێی پێشدەکەوێت. لەبنەڕەتدا هەوڵدەدات جموجۆڵە بێ ئەنجام و پەرتەوازەکانی تیرەکان ڕێکبخات، کە لەبەرامبەر سۆمەر و میسرییەکان ئەنجامیان دەدا. ئەم پەرتووکە بەقووڵایی لەژێر کاریگەری ئەفسانەکانی سۆمەری و میسرییەکان دایە. بەجۆرێک لەجۆرەکان ئەم کەلتوورانە بەگوێرەی پێکهاتەی تیرەکان دەگۆڕن و دەیگونجێنن. لەڕێگای حەزرەتی موساوە ئیسرائیل بەرەو ئایینی قەوم درێژە بەگۆڕانکاری دەدات. یەهودییەکان لەگەڵ دەرکەوتنی حەزرەتی عیسا دووچاری پارچەبوونی چینایەتی هاتن، (تەورات یان ئینجیل) یاخود سەردەمی کۆن یان نوێ (عهد قدیم او جدید) بۆ دوو لایەن دابەش بوون. لەکاتێکدا " عەهدولقەدیم" پەرتووکی کۆنی یەهودییەکانە، (عەهدولجەدید) دەبێتە پەرتووکی تەواوی مرۆڤایەتی چەوساوە، بەمجۆرە ڕێکدەخرێت و دەبێتە خاوەن بانگەشە. لەم سەردەمەدا ئورفا دەبێتە ناوەندی ئایینی کریستیانی.

ئەو بزووتنەوە ئایدۆلۆژییەی لەناوچەی ئورفا و دەوروبەری دەستی پێکرد، زۆر قووڵتربوو لەوەی کە شیمانە دەکرا. لێرەدا شوێن ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت. ئەم ناوچەیە کە بەمەودایەکی چۆنیەک لە ( هیتیت ـ ئاشور ـ میسر) دوورە ڕۆڵی هاوسەنگی دەبینێت. تاڕادەیەک لەنێو زەمینەیەکی ئازاد دایە. لەبەرامبەر نوێنەرەکانی خەڵکی خۆجێیی و نوێنەری ناوەندە ئیمپراتۆریەکان هێندە بەهێز نین. لەم واتایەدا لەساڵانی (2000) پێش زایین بەدواوە ئورفا ڕۆڵی ناوەندێکی گرنگی ئایدیۆلۆژی دەبینێت. پێکهاتەی خەڵک (گەل)ەکەی بناخەیەکی بەهێز پێشکەش بەمە دەکات. تیرە بەرەچەڵەک ئاریان و ئامورییەکان بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ یەکتریدا دەژین. تەنانەت لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماند ئەم پێکهاتە دیموگرافییە بەردەوامە. لەباشوور عەرەبەکان، لەباکووریش وەکو کورد بەدرێژایی (5000)ساڵ ئەم ناوچەیە بەردەوام هاتووچۆی دانیشتوانی بەخۆیەوە بینیوە. دواتر ئەرمەنی و تورکەکان دێن بەشداری ئەم پێکهاتە دیموگرافییە دەکەن.

هەم لەبواری جوگرافی، دیموگرافی، هەم لەبواری ئابووری و بازرگانی ناوەندێکی گرنگ و پڕ بایەخە. لەبەرامبەر هەرسێ ناوەندی کۆیلەداری، واتە کۆیلەداری ئەنادۆڵ، سۆمەر و میسر، لەمیانەی پێکهاتەی بەهێزی دیموگرافی، بازرگانی و ئابوورییەوە تەواو لەناوەڕاستیاندا دەبێتە زەمینەی بزووتنەوەیەکی نوێی ئایدیۆلۆژی و سیاسی. ئەم جیاکاری و تایبەتیبوونی خۆیشی لەژێر ناوی شاری پێغەمبەران و ئورفای پیرۆزەوە نیشاندەدات. کاردانەوە و ڕقی گەلی ناوچەکە لەبەرامبەر کۆیلەداری لەمیانەی ئەم سەرهەڵدانە ئایدیۆلۆژییە نوێیە، ڕێگا لەپێش دەنگدانەوەیەکی مەزن دەکاتەوە. بەخێرایی دەبێتە موڵکی خەڵک و وەکو بزوتنەوەیەکی سیاسی و جەماوەری لێدێت. لەدایک بوونی دەوڵەت بەپلەی دووەم ڕۆڵ دەگێڕێت. بۆ خۆیشی ناوەبەناوە دەبێتە ناوەندی دەوڵەتەکان. تاوەکو چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم درێژە بەم دۆخەی خۆی دەدات.

دوای ئایینی کریستیانی ساڵانی (640) بەدواوە ئاشنای ئایینی ئیسلام دەبێت. ئایینی ئیسلام کۆمەکێکی زیاتربە کەلتووری شاری بازرگان و پیشەکاران دەکات کە لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا گەورە دەبن، کەلەمیانەی بازرگانییەوە بوون بە خاوەن هێز. لەناوچەکەدا ڕێگای بازرگانی باکوور ـ باشوور، ڕۆژهەڵات ـ

ڕۆژئاوا زۆر چالاکە. کاریگەری هەزاران ساڵەی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری دەرفەت بە بەردەوامبوونی پێگە گرنگەکەی دەدات. لەگەڵ هاتنی ئایینی ئیسلامدا ڕۆڵی ناوەندێتی بەردەوام و زیاتر دەبێت. تاوەکو ساڵانی (1000)ی زایین لەژێر دەسەڵاتی عەرەبەکاندا دەمێنێتەوە، (990 - 1080) لەژێر فەرمانڕوایی کوردە مەروانییەکان، دواتر دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی تیرەی (ئارتوک ئۆغوللاری = کوڕانی ئارتوک) بەرچەڵەک تورک، لە (1200)ی زایینی دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی (ئەیوبی ـ کورد). لەساڵانی (1500) بەدواوە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان. لەکاتێکدا وەکو گەل کورد لەپێشەوە دێت، پاشماوەی ئاشورییە کۆنەکان، ئەرمەنی ـ سوریانییەکان، عەرەب و تورکەکانیش دەبن بەخەڵکی نیشتەجێی ناوچەکە. وەکو ناوەندێکی سەرجەم کەلتوورە ئایینی و پێکهاتە ئەتنیکییەکان، پێکهاتەیەکی تێکەڵ نیشاندەدات. لەناوچەکە تەنیا کەلتوورێک زاڵ نییە، هەمەلایەنە و فرەڕەنگی پێکهاتە کەلتوورییەکەی بۆ کۆنترین سەردەمی مێژوویی دەگەڕێتەوە. بەگشتی پیرۆزی لەهەموو قۆناخێکدا جێگای باسە. هەروەکو ڕوونمانکردەوە ئەمەش بۆ پێگەی ناوەندێتی شۆڕشی کشتوکاڵی و ئایدیۆلۆژیای پێغەمبەرایەتی دەگەڕێتەوە.

ئەم کورتە باسەش دیاریدەکات کە ئورفا و دەوروبەری خاوەن پێکهاتەیەکی مێژوویی تێکەڵن. کەلتوورە ئەتنیکی و ئایینییەکەی بەناویەکدا چووە، لەناوەڕۆکی خۆیدا کەلتوورێک زاڵە کە پشت بەئابووری و بازرگانی دەبەستێت. لەکاتێکدا لە ناوچەیەکی بەرفراوانی دەشت و شاخەکاندا، لەنێو کشتیار و ڕەوەندەکاندا بەشێوەیەکی ڕێژەییش بێت سیستەمی تیرە ـ عەشیرەت زاڵە کە خەریکی بازرگانین، لەناوەندی شاریش دانیشتوانێک جێگای باسە کەخاوەن پێکهاتەیەکی فرە ئەتنیکی، کەلتووری و ئایینین و خەریکی بازرگانین. ئەم ڕەوشە کە وەکو خەسڵەتی شارە سۆمەرییەکانە تارۆژگاری ئەمڕۆشمان هاتووە. ناوچەیەکە بەچڕی دەسەڵاتدارانی سەردەمی کۆیلایەتی ـ نەمرود، بەگ، میر و نەجیبزادە دەسەڵاتدارەکانی سەردەمی دەرەبەگایەتی ناسیوە. مەنجەنیق و فڕێدانە ناو ئاگر کە لەسەردەمی نەمرودەکانەوە ماوەتەوە، پێویستە وەکو هێما و سیمبۆلێکی ئەم شەڕە ڕیشەدارە ئابووری و ئایدیۆلۆژیە بەکاریگەرە دەرکی پێبکرێت. چەمک و پێناسەی نوێ بۆ ئورفا پێویست ناکات، بەپیرۆزی و نەفرەتەکانی خۆیەوە گەیشتۆتە سەدەی بیستەم، بەڵام بەرچاوترین و سەرنجڕاکێشترین وەرچەرخان ئەو پێشکەوتنەیە کە لەنێوان پیرۆزی و نەفرەتدا ڕوویداوە.

کەلتووری ئورفا کە هێشتا هەرە زێدە پێداگری لەسەر پیرۆزی دەکات و لەم پێناوەدا لەنێو بەرخودانداییە، لەڕاستیدا لەبەرچاوانە کە پیرۆزی دووچاری خیانەتی هەرە گەورە بووە. سیستەمی درۆ و ستەمکاری کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی ناوەڕۆکی پیرۆزییان پووچکردووە. ئەم زاراوە شکۆدار و پڕواتایە تووشی داگیرکاری ئەو نەفرەت لێکراوانە بووە کە بەردەوام کارەکتەری دەسەڵاتدارێتی و چەوسانەوەیان گۆڕانکاری بەسەردادێت. ڕەوشێک دێتە ئاراوە کە سەراوژێر و پێچەوانەکراوەتەوە. لەکاتێکدا ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی پیرۆزی مۆرکی نەفرەتی لێدەدرێت، نەفرەتیش بەتایبەتمەندی پیرۆزی دادەپۆشرێت. ڕەنجدەران دەخرێنە پێگەی نەفرەت لێکراوی، شوێنکەوتو (اتباع) و نەوەکانی نەمرود دەمامکی پیرۆزی دەپۆشن. ناوەوەی شار و بەکرێگیراو و نۆکەرەکانی ناوچە پێدەشتەکان هەزاران ساڵە ڕێککەوتنێکی خیانەتکارانەیان لەدژی ڕەنجدەرە ڕاستەقینەکان ئەنجامداوە. پێویستە ئەم ڕێککەوتنە بەباشی شیکاربکرێت. تاوەکو ئەم ڕێککەوتنە شیکارنەکرێت، مەحاڵە ئورفا و دەوروبەرەکەی لەگەڵ مرۆڤایەتی شکۆداری ڕابردوو، سەرجەم بەها پیرۆزەکان، پێغەمبەر و شوێنکەوتووە بێشمارەکانی بەیەکتر بگەنەوە.

دوژمنانی پیرۆزی لەژێر دەمامکی پیرۆزیدا بەرامبەر بەرەنج و گەلان لەنێو خیانەتێکی چۆندان؟ لەسەردەمی سۆمەرییەکان بەدواوە ئەم گەمەیە چۆن بەردەوامیکردووە و تا رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە؟ هەوڵمدا سەرەداوی ئەمانە بەدەستبخەم. ئەمانە ئەو چینە خیانەتکارەن کە بەپێی بەسەرچوونی کات مارژیناڵ (پووچ)بوونە. هەم لەبەرامبەر هەمان گروپی ئەتنیکی، هەم لەبەرامبەر ئەو کەلتوورە پڕ لە پیرۆزییەی خۆیان خیانەت دەکەن، تەواوی هێزەکەیان؛ ئەو هاوکارییەی کە لەگەڵ ناوەندەکانی کۆیلایەتی پێشیانخستووە، پەیرەوکردنی ئەشکەنجە و فشار، هەڕەشەی مەنجەنیق و فڕێدانە ناو ئاگرە، ئەم هێزەش لەپووچکردن و خاڵیکردنەوەی ناوەڕۆکە ئایدیۆلۆژییەکەی و پۆشینی رووپۆش و شێوەکەی وەردەگرێت. مسۆگەر ئەمانە هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان بەئایینی دایکە خوداوەند و ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمەوە نییە. بەهیچ شێوەیەک ئایین ناناسن. ئەمانە ئایینیان کردۆتە ئامرازێکی ترساندن. بەدوای خوداوەندێکی ساختە کەوتوون کە لەخواوەندی راهیبەکانی سۆمەر مەترسیدارترە. هەرە زێدە ناوی خودا و ئایین دەکەنە وێردی سەر زمان و خوازیارن لەو رێگایەوە خیانەتە مێژووییەکەیان بشارنەوە.

پەیوەندییەکانی ئورفا و ئایین دەشێت بکرێت بە مژارێکی سەربەخۆی لێتوێژنەوە. زۆر بەراشکاوانە دەبێت ئاماژە بەوە بکەم کە: راستییە پیرۆزەکان هێندە دووچاری خیانەت هاتوون، بەرلەهەموو شتێک پێویستە ئەم شارە باوەڕمەندە لە باوەڕمەندە ساختەکان پاک بکرێتەوە. دەبێت بگوترێت ئیتر هێندە خیانەتکردن لەئایین بەسە، دەبێت کۆتایی بەسیستەمی راهیبەکانی سۆمەر بهێنرێت. هیچ گرنگ نییە کە زانان یاخود نا. ئەمە رەوشێکە بووە بە کەلانە، ئەمەش بەهێزترین ئەڵقەیە. بەکرێگیراوەکانی دەرەوەی شار و ناوەندەکەی، ئاغا، میر و پاشماوەکانی شێخایەتی و سەرۆک خێڵی ئیتر لەم بێشکەیەی مرۆڤایەتی هەریەکەیان وەکو دووپشکێکی ژەهراوی، ژەهر بەرهەمدێنن. ئیتر ژەهراویکردنی ناوچەکە بەسە. ئەمانە چۆن هیچ شتێکیان پێشکەش بە گەلە قەشەنگەکەی ئەم ناوچەیە نەکرد، بەردەوام نکۆلییان لێکردووە. سەرباری ئەوەی هەزاران ساڵە لە بەرهەمەکەی دەخۆن، بۆ خۆشیان لەڕەوشێکدان ناتوانن هیچ شتێک پێشکەشبکەن. بەردەوام خۆراکە بەتام و بەچێژەکانی ئورفا بەدیاری بۆ ناوەندەکانی کۆیلەداری دەنێرن. ئێستا بەفرۆکە بەشێوەی پاکەت بۆ تەواوی جیهانی رەوانە دەکەن، بەڵام ئورفا و دەوروبەری هەتا دوایی هەژارە، برسی و بێکارە. لەکۆنترین و بەپیتترین زەوییەکانی جیهاندا ئەم رەوشە ناهەموارە جێگای باسە. لەو شوێنەی کە هەرە زێدە زمان و کەلتووری تێدا پێشکەوت، زمان و کەلتووری گەل کەوتۆتە رەوشێکەوە کە ناناسرێت و گوزارشتی لێناکرێت. بەڵام خیانەتکارەکانی وەکو بولبول قسە دەکەن و دەبنە پاڵەوانی کەلتووری نارەسەنی. دەنگ، مۆسیقا و ئاوازە خەمناکەکانی خودی خوداوەند و خوداوەندەکانیان کردۆتە ئامرازی کاڵا هەرزانەکانی بازاڕ.

خیانەت هێندەی دەتوانێت ئەستوور و دەوڵەمەند بووە. گەلیش هەژار و بێزمانە، هێندەی بڵێی کەوتووە. ئەم ناکۆکییە لەناوچەی ئورفا لەبەرزترین ئاستدایە و خەسڵەتێکی کرۆنیکی هەیە. نامۆبوونی گەل لەهەبوونی خودی خۆی لەقۆناخێکی تاریکدایە. واتای نەفرەت و پیرۆزی سەرەتای مێژوو پێچەوانە کراوەتەوە. مێژوو وەکو دەستپێکی پەرەسەندنەکان نییە، بەپێچەوانەوە بەکۆتایی پەرەسەندنەکان پشت ئەستوورە، پیرۆزی شوێنی نەفرەتی گرتووە، نەفرەتیش رۆڵی پیرۆزی دەبینێت. لەسەدەی بیستەمدا ئەم ناکۆکییە بەخەستییەکی زیاتر بەردەوام بوو. سەرتاژێر وەکو سەدەیەکی نەفرەت باڵی خۆی بەسەر تەواوی کونوکەلەبەرەکانی ژیاندا کێشاوە.

لەگەڵ رووخانی ئیمپراتۆرییەتی دەرەبەگایەتی عوسمانیدا، تورکەکان بە سەرکێشی (مستەفا کەمال) لەڕێگای رزگاری نیشتمانییەوە پێکەوە لەگەڵ کورداندا بەرەو ئاواکردنی کۆماری تورکیا هەنگاوییان ناوە. کوردەکانی ئورفاش پشتگیریان لەم قۆناخە کرد. کوردان بەشێوەیەکی سەرتاپاگیر وەکو ئەندامێکی ستراتیژی بەشدارییان لە رزگاری نیشتمانی و ئاواکردنی کۆماردا کرد. بەشی ئورفاش لەمەدا وەکو قارەمانێک خەڵاتکرا، بەڵام بەهۆی یاخیبوونەکانەوە، رەنگدانەوەی ئەرێنیانەی کۆمار نەبینرا. بلۆکی بەکرێگیراو کە پاشماوەی سەردەمی سۆمەرییەکانە سوودی لەم رەوشە وەرگرت و شوێنی خۆی دۆزییەوە. داردەستەکانی رژێمی

کۆیلایەتی کە هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان بە بەهایەک لەبەهاکانی کۆمارەوە نەبوو لەمیانەی ئەزموونە مێژووییەکەیانەوە، بەبێ ئەوەی هیچ وابەستەیی و ڕێزێکیان بۆ بەها نیشتمانی و دیموکراتییەکانی سەدەی بیستەم هەبێت، وەکو بلۆکی دەسەڵاتداری خیانەتکاری خۆجێیی بەباشی کارەکانی خۆیان بەڕێوەبرد. پەیوەندیان بەهیچ ڕۆشنگەرییەکی کۆمارەوە نییە. لەژێر پۆشینی دەمامکی پیرۆزی، تەنانەت لەدەرەبەگایەتیش پاشکەوتوو تر لەمیانەی کەسایەتییەکی سواو و نکۆڵیکار لە شار و دەرەوەی شار تۆری بەرژەوەندی پەرستی بەڕێوەبردووە. پێکهاتەی ئەتنیکی و کۆمەڵایەتی گەل هێشتا بۆ کرانەوەیەکی پێشکەوتنخوازی وەرنەچەرخاوە. جلوبەرگە کۆنەکە لەجاران زیاتر گوشیویەتی. لەوڵاتی خۆراکدا بووە بە نەدارترین و هەژارترین توێژ. لەناو دەوڵەمەندترین کەلتووردا خراوەتە ناو قووڵترین بۆشاییەوە. لەدوا چارەگی سەدەی بیستەمدا جارێکی دیکە سەرهەڵدانی نەریتێکی نوژەنی پێغەمبەرایەتی هەر وەکو بڵێی بووە بەچارەنووسێک.

ئێستا لەهەڵسەنگاندنەکاندا گەیشتوینەتە قۆناخی دەرکەوتنی (PKK) لە ئورفا. لەڕووخساردا وەها دیاردەبێت کە بناخەی (PKK) لەئەنقەرە دانراوە. کەچی بەشێوەیەکی تیر و تەسەل باس لە نەتەوەپەرستی هاوچەرخ و سۆسیالیزم دەکرێت. هەوڵدەدرێت وەکو هاوشێوەکانی لێبکەن. تەنانەت لەکۆتاییدا خوێنیش دەڕژێت. سەبارەت بەبابەتی (PKK) هەڵسەنگاندنی بەرفراوانم کردووە. هەوڵمدا دوا نرخاندنەکانم لەدانیشتنەکانی ئیمراڵیدا بکەم. لێرەدا دووبارەکردنەوەیان واتایەکی ئەوتۆی نابێت، بەڵام ئەو ڕەهەندەی سەرنجم ڕادەکێشێت. " چ جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ ڕاستینەی مێژوویی و هەنووکەیی ئورفا هەیە؟" بەڵێ ناتوانم بەردەوام پرسیارێکی بەمجۆرە لەخۆم نەکەم. وەکو دامەزرێنەری (PKK) و وەک یەکێکی خەڵکی گوندی ئۆمەرلی کە دەکەوێتە نزیک ڕووباری فورات و ئەوپەڕی خاڵی باکووری شاری ئورفا، دەبێت ئەمە ڕێگا لەپێش چۆن کاریگەریەک بکاتەوە؟ ئەوەی جێگای باس و کارتێکردنە کەلتووری گوندە یان شار یاخود بەها گەردوونییەکانە؟ وەکو بانگەشەی بۆ دەکرێت ئایا توانی لەبوون بەبزوتنەوەیەکی هاوچەرخ سەربکەوێت؟

کاتێک بگەڕێینە دواوە و تەماشا بکەین دەبینین، ئەو ڕاستینەیەی بەشێوەیەکی سەرەکی مۆری خۆی لەکردار و پراکتیکی ئێمەداوە، شێوەی نوژەن و هەنووکەیی پێغەمبەرایەتییە، ئەم لایەنە زیاتر قورساییەکەی دیارە. من و تەنانەت (PKK)ش هێندە پەیوەندیمان بەسەدەی بیستەمەوە نییە. لەبواری ڕووخسار و گووتەوە وەها دیارە کە پەیوەندی لەگەڵ ئەو سەدەیە بەستووە. بەڵام ئەوە بڵێم کە وەکو کەسایەتی من هیچ نەگەیشتمە کەسایەتی و ڕۆحی سەدەی بیستەم ـ بێگومان ئەگەر شتێکی بەمجۆرەش هەبێت ـ من لێی تێنەگەیشتم و هەرسم نەکرد. هەربۆیە ئەوکات لەڕەوشێکی وەهادا دوور بووین واتا بدەینەوە کۆماری تورکیا، ئەورووپا و یەکێتی سۆڤییەت. وەکو شارستان دیارە، هەندێک لەجلوبەرگەکانیشی پۆشیوە، بەڵام ئاشکرایە کە لە ڕۆح و هۆشیارییەکەی بێئاگا و دووره. لەوەش سەیرتر ئەوەیە، دوورم لەوەی دەرکەم بەدونیای دەرەبەگایەتی بەسەرچوو کردبێت و هەرسم کردبێت..

هیچ یەکێک لەتایبەتمەندیەکانی ئەو کەلتوورەش نەگەیشتە واتای خۆی. بەشێوەیەکی گەوهەری هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ جیهانی بونیادنراودا دانەنا، هیچ شتێکیش لە قۆناخی بەسەرچووی سەردەمی دەرەبەگایەتیش تێنەگەیشتبووم. منداڵێک بووم بەتەنیا مابوومەوە. لایەنی سەیری مەسەلەکە ئەوەیە کە لە ناو خێزان، گوند و قوتابخانەشدا ڕەوش بەهەمانشێوە بوو. ناوی دایک و باوک، زاراوەکانی لەجۆری برا، ژن، پیاو، مامۆستا و خزم زیاتر لەئاستی زارەکیدا دووبارە دەبوونەوە. لەئەنجامدا ئەوە دەردەکەوێت، کە پێدەچێت لەم دونیایە لەهیچ تێنەگەم. توانای تێگەیشتنی ئەو بابەتانە نیشاندەدەم کە خوازیارن فێرم بکەن، بەڵام لەڕووخساردا هەوڵدەدەم وەکو هاوشێوەکانم بم، کامەیان باشترینیانە ڕێز لەوەدەگیرێت و پێشدەخرێت. بەڵام دیسان بێ بەشبوون لە ناوەڕۆک بنەڕەتییە. بۆ ئەوەی (PKK)ش وەکو هاوشێوەکانی دامەزرێت و کاربکات، بە هەوڵوکۆششی پێویست دادەمەزرێت و پێشدەخرێت. تاوەکو دەبێتە سەرنجراکێشترین ڕێکخستنی جیهان.

هەمووی هەروەکو بڵێی لەبەرخاتری ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم) ئەنجامدەدرێت. کاتێک کار بەهێز و جددی بوو، گەیشتە سنوورە هەرە هەستیارەکانی ژیان، دەردەکەوێت کە ئەم راستینە دووچاری دوولایەنی دەبێت.

لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەم هەرکەس دەیخواست بەباشترین شێوە (PKK)بکاتە هی خۆی و بەکاری بێنێت. ئەمەش بەهەموو قورساییەکیەوە لەواقیعدا خۆی نیشاندەدا. بەتەنیا مامەوە، راستتر بڵێم جارێکی دیکە لەقووڵاییەوە پێوەن و تەنیاییم هاتەوە بەرگوێ، ئەو تەنیاییەی کە سەرەتا و هەموو کاتێک رووبەڕووم دەبوویەوە. تایبەتمەندێتییەکی پیاوی تەنیام درکاند:" کە لەدەرەوەی چاخەکانە، بەڵام لەگەڵ هەموو چاخەکاندایە". گوتم دەرکم بەمڕاستییە کردووە. دەزانم ئەوانەی نزیک بەقۆناخی شکۆداری دەبنەوە، لەم تایبەتمەندییە نزیک دەبنەوە. چەندە لەو سەردەم و زەمانە دابڕێی کە تێیدا دەژین، هێندە بۆ ناو تەواوی زەمەنەکان درێژ دەبێتەوە. لەرەوشی بەرجەستە و واقیعی (PKK)دا لەم دۆخەدا ژیام. مسۆگەرە کە ئەمە قوتابخانەیەکی نائاساییە.

بەو ئەندازەیەی سیفەتەکانی لەجۆری جوداخواز و لایەنگری توندوتیژی پەسەند ناکەم، زۆرباش دەزانم کە لەدڵەوە ئارەزووی چالاکی لەو جۆرەمان نەبووە. ئەوەی هەرە زێدە خوازیاری بووین و ئارەزووم دەکرد، هەموو شتێک بەشێوەیەکی ئازادانە گفتوگۆ بکرێت، ئەو ئەنجامەی کە پەسەندیش دەکرێت پراکتیزە بکرێت. حەزم لەم پەیڕەوە دەکرد. لەئامانجی چالاکییەکانمدا بەردەوام ئەم خاڵەم رەچاوکرد. کاتێک دەمگوت:" لە موخاتەبێک دەگەڕێم" مەبەستم ئەمە بوو. بەهۆی رەوشی داخراوبوونی راستینەی تورک، هیچ ئەگەری ئەوەم دانەنا بکەوێتە ناو دیالۆگەوە. لەسەردەمی (ئۆزال) و قۆناخەکانی دواتردا بەهیچ شێوەیەک باوەڕم بەهەوڵی لەم جۆرە نەکرد. تاوەکو دەرکمان پێکرد ـ ئەم لایەنەی چەمکی چالاکییش گرنگە ـ بانگەشەکانی دیکە لەمەسەلەیەکی رووکەشی بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکە نابینێت.

بۆ شرۆڤەکردنی قۆناخی ئیمرالی هەوڵوکۆششێکی زۆر دەدەم. دەتوانرێت بگوترێت کە لەبواری چەمکدا لەهەموو قوناخێک زیاتر زیندوو و قوڵبوومەتەوە. لەگەردوونەوە تاوەکو دەگاتە مێروولەیەک، پێشکەوتنی توانای تێگەیشتنی هەرشتێک وەکو راستینەی خۆی واتادار دەبینم. تەواو دەزانم و هەست بەوە دەکەم کە گەورەترین شەڕ قووڵکردنەوەی مەعریفە و گەیشتنە بەئاستێک کە لەتاوێکدا دەرک بەسیستەمی سروشتی ناو هەموو شتێک بکرێت. ویستم ئەمە نیشانی (PKK)ەش بدەم و تێیدا رەنگبداتەوە. نەک تەنیا بەرەچاوکردنی یەکێتی سیاسی و نیشتمانی تورکیا، بەڵکو بەیەکەوە لەگەڵ تەواوی وڵات و گەلانی دراوسێ، تەنانەت ئەگەر تۆزقاڵێکیش دەرفەت هەبێت ئەو دەسکەوتانەی لە یەکێتی نێوانیان بەدەستدێت، ئەگەر بەگوێرەی رۆحی یاساکان بێت، لەگەورەترین جەنگ بەهادارترە و بژارێکە شایەنی هەڵبژاردن و پەیڕەوکردنە. تەنیا هەرکەس، هەموو لایەک هێزی وابەستەبوون بەرۆحی یاساگەردوونییەکان نیشانبدات. دوای بەدیهاتنی ئەمە، یەکێتی لەگەڵ تەواوی گەل و وڵاتان خودی ئامانجە. بەبێ دوودڵی رووم لەم هەڵوێستە کرد.

بەردەوام باوەڕیم بەبەرگری رەوا هەیە. بڕوام بەوەش هەیە کە یاسایەکی سروشتە. هەرچەندە هێرشکاری لەسروشتدا هەبێت، بەڵام ئەوەی بنەڕەتییە یاسای هەبوونی سروشتی بوونەوەرەکانە. بەرگری رەوا بەو واتایە دێت. هیچ گومانێکم لەوە نییە تەنانەت تاکە کەسێکیش دەتوانێت بەرامبەر جیهان سەرکەوتوانە بەرگری رەوا پێشبخات. ئەوەی لێرەدا جێگای بایەخە، هێزی جەستەیی لایەنە بەرامبەرەکان نییە، بەڵکو یاساکانی رۆحی پێشکەوتنە. لەم سۆنگەوە مسۆگەر رەوشی بەرگری رەوای ئێستای (PKK)ە پێویستە. لەو بڕوایەدام تاوەکو رێگا لەپێش سیستەمی حقوقی گەردوونی و یەکێتی ئازاد دەکرێتەوە، بەرگری رەوا بۆ هەرکەس، تەواوی گەلانی دراوسێ و ناوچەکە پێویستە. لەمە بەدواوە گرێدراوی ئەو هەڵوێستەیە کە دەوڵەتی پەیوەندیدار نیشانی دەدات. ئەگەر پەلامارەکان بەرگری رەوا تەنگەتاو بکات، ئەوا رێگا لەپێش پێشکەوتنی زەمینەی توندوتیژی دەکرێتەوە. لەرێگای هێرش و پەلامارەکانەوە هێرشکردنەسەر بەرگری رەوا هیچ دەسکەت و

قازانجێکی بۆ دەوڵەت نابێت، بەڵام ئەوانە بەهێز دەکات کە لەرەوشی بەرگری رەوادان. راستترین هەڵوێست، بەکراوەیی هێشتنەوەی دەرگایە لەبەردەم دیموکراتیزەبوونێکی تەواودا، چارەسەرکردنی گشت کێشە و گیروگرفتەکان و لایەنگیریکردنە لە رێککەوتنی دیموکراتییانە.

دەرک بەم راستییە دەکرێت کە بەرگری رەوا بەردەوام رێگا لەپێش گرژی دەکاتەوە، ئەمەش لەئاکامی دۆخ و بوویەری چاوەڕواننەکراودا، حاڵەتی ترسناک لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

رەخنەی توندم دەرهەق بەچەمکی چالاکی و کردەوەکانی رابردووی (PKK) پێشخست. هەوڵمدا بیهێنمە سەر رێبازی بەرگری رەوا، بەڵام وەکو دەمویست سەرکەوتوو نەبووم. ئەو ئەنجامەی سەبارەت بە بابەتی توندوتیژی پێی گەیشتم: تاوەکو هێرش نەکرێتە سەر مافی ژیان و گوزارشتی ئازادانەی هەبوون، هیچ دژە هێرشێک ئەنجامنەدرێت، تەنانەت یەک دڵۆپە خوێنیش نەرژێنرێت. ئەمە پێویستییەکی فەلسەفەی ژیانی ئازادمە کە هەوڵدەدەم پێیەوە گرێدراو بمێنم.

ئەگەر مرۆڤ هۆشیاری خۆی لەدەستنەدات و بزانێت چۆن پەند و ئەزموون وەردەگرێت، گرنگترین قۆناخەکانی وەرچەرخان لەبەسەربردنی بوویەرە قورس و سەختەکاندا بەدەستدەخرێت. لەو بڕوایەدام کەساڵانێکی درێژ لەناو ئەم جۆرە بوویەرە سەخت و پڕ لەئێشانەدا ژیانم بەسەر برد و وەرچەرخانم لەنێو ئەم هەلومەرجەدا ئەنجامدا وە لەم بەرگرینامەیەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان باسم لەو دەرئەنجامانە کرد کە پێی گەیشتووم. شیکردنەوەکانی خۆم سەبارەت بەجیهان، رۆژهەڵاتی ناوین، وڵات، کۆمەڵگا تاوەکو دەگاتە دەوڵەت خستووەتەڕوو. جارێکی دیکە لەژێر رۆشنایی ئەم شیکردنەوانە تەماشای راستینەی ناوچە ئورفا دەکەم و پێشخستنی دیدگایەک بۆ سەدەی بیستەم و یەکەم بە ئەرکی خۆم دەزانم.

جارێکی دیکە ئورفا رووبەڕووی گێڕانی رۆڵی مێژوویی خۆیەتی. دیسان دەبێت پێهەڵگرتنێکی مێژوویی ئەنجامبدات، پیرۆزی و نەفرەت لەو شوێنەی کە مافی خۆیەتی جێگیر بکات. لەواقیعی وڵاتدا ئورفا ئەو ناوچەیەیە کە نەریتەکانی پاشماوەی دەرەبەگایەتی تێدا زۆر بەهێزە، تەنانەت پاشماوەکانی زهنییەتی سیستەمی سۆمەریشی تێدا کەم نییە. لەپێدەشتەکانیدا تارادەیەکی مەزن زهنییەتی نیولیتیک جێگای باسە. بەها و کایەکانی سەرمایەداری کاری لەناوەڕۆکەکەی نەکردووە، بەشێوەکی تەکنیکی کاریگەری کردووە. لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەری لەناو وڵاتدا بۆخۆی وەکو وڵاتێک وایە. لەپێکهاتەی ئەتنیکی و کەلتوورییەکەیدا فرەڕەنگی بەردەوامە. نموونەیەکی بچووکی مۆزاییکی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوینە. رۆژهەڵاتی ناوین بۆ جیهان گوزارشت لەچی بکات، ئورفاش بۆ رۆژهەڵاتی ناوین بەهەمان واتادێت، هەمان گرنگی و پێگەی هەیە. ئەمەیە ئەو تایبتمەندییەی کە لەمێژوودا بەگێڕانی رۆڵی هاوشێوە ناودەبرێن. لەگەڵ دەستپێکردن و پراکتیزەکردنی پرۆژەی ( گاپ ) ئەم رۆڵەی گرنگ و زیاتر بووە.

بێگومان ئورفا کێشەی ئابووری، کۆمەڵایەتی و کەلتووری گرنگی هەیە، ئەمەش راستە کە بەوەبەرهێنانێکی سنووردار پێشکەوتنێکی گەورە ئەنجامدەدات. بەڵام گەوهەری رۆح هەڵکێشی کێشەکە سەرچاوەی خۆی لەم بابەتانە وەرناگرێت. کێشەی سەرەکی پەیوەندی بەگۆڕەپانی ئایدیۆلۆژییەوە هەیە. خەسڵەتە هەرە کۆن و قووڵەکانی موحافەزەکاری( دۆگماتیزم) لەسەر پێکهاتەی زهنییەتەکەیدا زاڵە، بەجۆرێکە کاریگەری لەسەر تەواوی وڵات دەکات. لەم چوارچێوەیەدا نەک تەنیا دۆگماتیزمی دەرەبەگایەتی، بەردەوامی بەتەواوی ئەو موحافەزەکارییە دەدات کە وەک میراسێک لەهێزە دەسەڵاتدارەکانی سەدەکانی رابردوو وەریگرتووە، شانبەشانی درێژە پێدانی بەدەوروبەریشیدا بڵاودەکاتەوە. وەک چەمکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی، بەرامبەر بەکۆمارێکی سیکۆلار (عەلمانی) و دیموکراتی داخراوە. ئەم زهنییەت و چەمکە سیاسییە تێپەڕ نەکرێت، لەدەوروبەری گاپ موحافەزەکارییەکی پێشکەوتووتر سەرهەڵدەدات. ئەو دەرئەنجامانەی لەگەڵ خۆیدا دێنێت گرنگییەکەی لە نموونەی (PKK) کەمتر نابێت.

بەرلەهەموو شتێک پێویستە شەڕی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی بەڕێوەببرێت. شۆڕشی زهنی دەکەوێتە سەرووی هەموو ئەرکەکانەوە. گرنگی ئەمە لە تاوانەکانی دابونەریتدا ئاشکرادەبێت. ئەگەر ژنێک بەهۆی رەفتار و هەڵسوکەوتێکەوە، کە سروشتیترین مافی خۆیەتی لەلایەن خێزان (بنەماڵە)کەیەوە بڕیاری مردنی بەسەردا بسەپێنرێت، کەواتە رەوشێکی زۆر مەترسیدار جێگەی باسە. تەنیا بەهۆی بێبەشبوونی لە ئازادی و مافی ژیان نییە، بەڵکو بەهۆی ئەو هەلومەرجە قورسەی موحافەزەکارییە کە باڵی بەسەر تەواوی کۆمەڵگادا کێشاوە، رێگرە لەبەردەم خستنەکاری ماتە ووزە (پۆتانسێل)ی ناوچەکە. لەڕەوشێکدا دەیهێڵێتەوە کە لەهەزاران چەتەی شاخەکان مەترسیدار بێت. بێگومان موحافەزەکاری هێزی خۆی لە راستینەی چینی دەسەڵاتدار و چەوسێنەر وەردەگرێت کەهەزاران ساڵ بەردەوام بووە. هەروەها پەیوەندییە سەرمایەدارییەکانی پێشدەکەوێت، لەوە زیاتر کە ئەو پەیوەندییە کاریگەری لەسەر چارەسەرکردن هەبێت، زیاتر لەسەر بنەمای پتەوکردنی ئەو موحافەزەکارییە بەکاردەهێنرێت، لەملایەنەوە ئەزموونی مێژوویی هێزێکی گەورەیان پێدەدات.

ئەو دەستێوەردانەی لەئاستی ئایدیۆلۆژی بۆ ناوچەکە بکرێت پێویستە لەچوارچێوەی پێوانە دیموکراتییەکان بێت، پێویستە ناوچەکە بەجۆرێک لەجۆرەکان بەرێنسانسدا تێپەڕبکرێت. بۆ ئورفا هیچ شتێک لە دیموکراتیزەبوون بەهادارتر نییە. پێویستی بە پرۆژەیەکی دیموکراتیزە بوون هەیە، کە بەئەندازەی گاپ بێت. بەرلەهەموو شتێک دەبێت بزانرێت کە ئەم پرۆسەیەی دیموکراتیزە بوون نەلەمیانەی بزووتنەوەیەکی گەل کەلەلایەن کۆمەڵگای کۆنەوە سەرهەڵبدات، نەلەڕێگای دەستێوەردانەکانی دەوڵەتەوە بەڕێوەنابرێت. بێگومان دەوڵەت و کۆمەڵگا دەستەوەستان نامێنن، رۆڵی خۆیان لەگۆڕانکاری و پێشهاتەکاندا دەبینن، بەڵام ئەوەی هەرە زێدە پێویستە پرۆژەیەکی بەرفراوانی کۆمەڵگای مەدەنییە. ئەو دەزگایانەی کۆمەڵگای مەدەنی کە بەبێ پێکدادان لەبەرامبەر دەوڵەت و کۆمەڵگا پێشدەخرێن، تەنانەت دەرفەت هەبێت هاوکاری یەکتری دەکەن، ئەگەر ئازادانە پێشبخرێن دەتوانن بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە رۆڵی شۆڕشی دیموکراتی ببینن. ئەو رێکخراوانەی کۆمەڵگای مەدەنی کەلەگشت گۆڕەپانەکان بە پێی پێویست ئاواکراون، زهنییەتی موحافەزەکاری دەشکێنن. کاتێک لەمەدا سەرکەوتن بەدەستبێنن بزووتنەوەی رۆشنگەری ئەو مێشک و هزرانە بەرەو پێش تاودەدات کە تینووی ئازادین.

لەڕاستیداخەسڵەتە بەهێزەکانی سەردەمی دایکسالاری ناوچەکە، پیرۆزییەکانی کەلتووری پێغەمبەرایەتی کە ماونەتەوە ئەگەر لەگەڵ پێوانە هاوچەرخەکانی دیموکراتیزەبوون بکرێتە یەک شۆڕشێکی رۆشنگەری تەواو روودەدات. ئەم یەکبوونە کاریگەری دەکاتە سەر ئەخلاق و دەرفەتی قەڵەمباز و هەڵمەتی بەهێزی رەفتار و ئاکاری ئازاد دەدات. هەربۆیە لەم بوارەدا هۆشیاری مێژوویی راست، زانستیبوون و پەروەردە دەرهەق بەبابەتەکانی فەلسەفەی دیالیکتیکی و تاکەکەسێتی گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە. دەبێت چەندین کۆمەڵە بەئامانجی پەروەردە بکرێنەوە. سەبارەت بەبابەتی هونەر لەپێناو گەلدا پێویستی بەهەڵمەتێک هەیە. تاوەکو کاریگەری سڕکەر و تێکدەرانەی هونەری ئێستا کۆتایی پێنەهێنرێت، ئازادکردن و رۆشنکردنەوەی زهنییەت و رۆح مەحاڵە. گفتوگۆیەک سەبارەت بە مێژووی ناوچەکە، هونەرەکەی و هەموو بابەتەکانی ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵگا سازبدرێت ئەنجامی سوودبەخشی لێدەکەوێتەوە. لەڕاستیدا لەلایەنی زهنییەتەوە پێویستی بەهەڵمەتێکی ئیبراهیمی نوژەن هەیە. بتەکانی ئێستا لەهی جاران زیاترن، بەشێوەیەکی بەرفراوانتریش جێگیرکراون. مێشک و دڵی مرۆڤایەتیان ئیفلیجکردووە. هەربۆیە پێویستە لەمیانەی کەسایەتی حەزرەتی ئیبراهیمەوە تەورەکە بەشێوەیەکی بەهێزتر بەکاربێنن (لەبواری مەعنەوی و هزری). رێزی راستەقینە لەبەرامبەر ئایین، پەیوەستبوون بە بەها پیرۆزەکان، وەڵامدانەوە لەمیانەی هەڵمەتێکی بەمجۆرە دەکاتە پێویستییەک. شۆڕشی شکاندنی بتە نوێکان بۆ ئورفا دەبێتە رێنسانێکی راستەقینە.

دیموکراتیزەکردنی سیاسەت دووەمین هەنگاوی گرنگ و بەهادارە. بەتایبەتی پێویستییەکی مەزن بەبزوتنەوەیەکی پارتیبوونی دیموکراتی هەیە. لە رێگای پارتێکی بەپرەنسیپ، کە خاوەن هێزێکی پێویستی کادیران بێت، هۆگری دیموکراتیزەبوون بێ، باوەڕی و ئاستی مەعریفی هەبێت، دەتوانرێت پێشەنگایەتی بۆ کۆمەڵگای مەدەنی بکرێت. کۆمەڵەکانی مافی مرۆڤ، ماڵی ئازادی ژنان و کۆمەڵەی لاوان ئاوابکرێن، دەتوانن رێگا لەبەردەم دیموکراتیزەبوون بکەنەوە. هەموو ئەو کەسانەی بایەخ و بەها بەهۆشیاری دیموکراتی و دامودەزگاکانی دەدەن، دەبێت جێگای خۆیان لەم کۆمەڵانەدا بگرن. ئەم کارە بەو کەسانە ناکرێت کەباوەڕی و هەوڵەکانیان تێرناکات. هیچ خەباتێک هێندەی تێکۆشانی دیموکراتیانە بۆ ناوچەی ئورفا و دەوربەری بەهادارنییە.

هەندێک لە دامەزراوە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکانیش جێگای بایەخن. بنکەی تەندروستی هەرزان بۆ گەل، کارکردنی هەرەوەزی، کێڵگەی بەرهەمهێنانی نموونەیی، هۆڵەکانی پەروەردەی وەرزشی چەند دەزگایەکن دەتوانن رۆڵی ئەرێنی ببینن. بەتایبەتی سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ، لەگشت گەرمەک و گوندەکان پێویستیمان بەنوێنەرانی حقوقی هەیە. تێکۆشانێک بەلانی کەم هێندەی هۆشیاری مێژوویی رێگا لەبەردەم هۆشیاری حقوقی بکاتەوە پێویستییەکی ژیانییە. دەزگا و دامەزراوەکانی لەمجۆرەی کۆمەڵگای مەدەنی فشار دەخەنە سەر دەوڵەت و کۆمەڵگا، ئەوانیش بۆ ئەوەی لەدواوە نەمێنن هەنگاو دەهاوێژن. لەم لایەنەوە بزووتنەوەیەکی کۆمەڵگای مەدەنی سەرکەوتن بەدەست بێنێت، ئەوکاتە ئورفا لەمێژووی خۆیدا کۆمەکێکی مەزن بەڕۆشنگەری راستەقینە و بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتی دەکات. شانبەشانی پێشکەوتنی تەکنیکی ژێرخان، ئەم پێکهاتانەی کۆمەڵگای مەدەنی و ئایدیۆلۆژی، لەبواری ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی ئورفا دەکەنە هێزی پێشەنگ. لەمیانەی پێکهاتەی بەپیت و دەوڵەمەندی خاکەکەی رێگا لەبەردەم دەوڵەمەندییەکی مەزن دەکرێتەوە. بێکاری، هەژاری و نەخۆشی، کە وەکو چارەنووسێکە کۆتایی پێدێت. ئورفا هێندەی وڵاتێکی ناوینی ئەوروپا یان رۆژهەڵاتی ناوین دەبێتە خاوەن رۆڵ. بەمجۆرە ئورفایەکی دیموکراتیک دەسکەوتێکی مەزنی مرۆڤایەتییشە کە کەلتووری هەر گروپێکی ئەتنیکی رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراتی وەک گوڵێک دەگەشێتەوە و لەسەر بنەمای بەیەکەوە ژیان و تەبایییەکی قووڵ لەیەکتری نزیکدەبنەوە. لەسەر ئەم بنەمایە واتایەکی راست بەپیرۆزییەکانی پێغەمبەران دەدرێت، بەڕاستی دەبێتە ناوەندێکی سەرنجراکێش و وەکو دووەمین شوێنی حەجی لێدێت. قۆناخی ئورفای دیموکراتی دەستپێدەکات کە هەرە زێدە هێز بەڕۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراتی دەبەخشێت.

ئەمە ئەو پەند و ئەزموونانەی من و (PKK) بوو کە لەناو بەئێشوئازارترین بوویەرەکانی وڵاتی ئازارەگەورەکان وەرمانگرتووە، هەروەها ئەو ئەنجامەیە کە دەرهەق بەدۆزی دادگایی کردنی ئورفا و حوکمەکەی پێیگەیشتووم.

باوەڕیم بەوە مسۆگەرە کە حوکمی مێژوو بەرائەتە، چارەنووسی وڵات و گەلەکەشم سەرکەوتنی دیموکراتیانەیە.

2001/7/10

عەبدوڵڵا ئۆج ئالان

ئیمرالی

هەنووکەیی کردنی
نەریتی حەزرەتی ئیبراهیم بەچ واتایەک دێت؟

ناوچەی ئورفا بەگشتی وەکو شوێنی لەدایکبوونی نەریتی پێغەمبەرایەتی بەتایبەتیش نەریتی حەزرەتی ئیبراهیم پیرۆزدەبینرێت. هۆکاری سەرەکی ئەم دیاردەیەش ئەوەیە کە بۆ یەکەمین جار کشتوکاڵ، کۆچەری (رەوەندی) و کۆمەڵگای شار بەشێوەیەکی تێکەڵ لەسەر ئەم جوگرافیا بەپێتەدا ئەنجامدراون و بەیەکتر گەیشتوون. ئورفا ناوەندی چاخی نیولیتیکە، کاتێک ناوچەکانی دەوروبەریشی بخەینە سەر هێشتا لەشوێنە بەرزەکاندا، ئەو تەپۆلکانەی دەردەکەون، ناوەندی سەدان شوێنی نیشتەجێبوونن کە هێشتا لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە نەکراوە و بەڵگەی سەلمێنەری ئەم راستییەن. بەپیتترین شوێنی نێوان رووبارەکانی دیجلە ـ فورات ـ چیاکانی تۆرۆس دەشتی ئورفایە. بەپیتبوونەکەی لە ئاستی جیهانیدایە، ئەم خەسڵەتەی تاوەکو ئێستاش بەردەوامە. گرێدراو بەمەوە کۆچەری پێکهاتەیەکی دیکەی کۆمەڵگایە کە لەنێوان چیا و دەشت ئاوابووە. لەسەردەمە هەرەکۆنەکانی مێژوو گوندی نیشتەجێ و رەوەندی لەناو یەکتردابووە. ئەمە تا نزیکەی (10،000) ساڵ پێش زایین درێژدەبێتەوە. ئاواکردنی ئورفا وەکو شار لەشێوەی کۆڵۆنیەکی سۆمەرییەکان بووە. ووشەی (ئور) لەزمانی سۆمەرییەکاندا بەواتای شاری سەر تەپۆلکەکان دێت. لەدەرەوەی میزۆپۆتامیای خوارو و یەکەمین کۆڵۆنی سۆمەرییەکان لە دەوروبەری ئورفا پێکدێت. ئورفا وەکو ناوەند، حەران، سامسات و کارگامیش لەدەوروبەری دروستدەکرێن. ساڵانی دووهەزار پێش زایین لەدەرەوەی سۆمەرییەکان، دووەمین ناوەندی هەرە گرنگ ئورفا و دەوربەرەکەیەتی. ئورفا گۆرەپانی سەرەکی پەلهاوێشتنە. وەکو ناوچە و کۆڵۆنی گرێدراوی پادشایەتی شارەکانی سۆمەرن. جیاوازی پێکهاتە ئەتنیکیەکەی بەرخودان بەرامبەر دەسەڵاتدارێتی سۆمەر دەکاتە ناچارییەک. کەچی دەزانرێت شارستانێتی سۆمەری شارستانێتییەکە یەکەمین جار کۆمەڵگای چینایەتی تێدا پێشکەوت، دواتر شەپۆل بەشەپۆل بەدەوروبەردا بڵاوبوویەوە. پێکهاتەی یەکسان و ئازادانەی کومەڵگای کشتوکالڕ و رەوەندی، بەسانایی ملکەچی بۆ ئەم جیاوازییەی چینایەتی ناکات، بەڵام کارەکتەری پێشکەوتووخوازی شار لەماوەی درێژخایەندا زاڵبوون دەکات بەڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر. هەربۆیە یەکەمین تاقیکردنەوەی سۆمەرییەکان بۆ ئاواکردنی کۆڵۆنی لەدەوروبەری ساڵانی (2،000) پێش زایین بەرخودانی دژوار لەگەڵ خۆی دێنێت.

گروپە ئاریانەکان (لەزمانی سۆمەریدا ئاری = گاسن)ی خوڵقێنەری کۆمەڵگای کشتوکاڵی و گروپە سامییە رەوەندەکان لەناوچەکە هەم بەناویەکدا چوونە، هەم لەدژی یەکترن. پەیوەندی بەهێزی بازرگانی لەنێوانیان پەرەدەسێنێت. لەکاتێکدا ئاریانەکان باکوور، رۆژهەڵات و رۆژئاوای ناوچەکە پێکدێنن، سامییەکان لەباشوور دەسووڕێنەوە. شاری ئورفا تەواو لەناوەڕاستیان ئاواکراوە. ئێستاش ئەم گەوهەرەی خۆی دەپارێزێت. بەوپێیە ئورفا وەکو شار و ناوچە لەساڵانی (2،000)پێش زایین لەبواری کشتوکاڵ، رەوەندی، پیشەکاری و ئاژەڵداری بەپێگەیەکی نموونەیی گەیشتووە. دوای میزۆپۆتامیای خواروو، لەرەوشی دووەمین شار(مەترۆپۆڵ)ی هەرە گەورەدا بووە. جوگرافیایەک کە تادواڕادە زیندووە، بۆ گۆڕانکاری کراوەیە، کۆمەڵگای شار، گوند و رەوەندی لەناویەکتردا لەخۆوە دەگرێت و دوو گروپی سەرەکی گەل، واتە ئاریانی و سامییەکان بەیەکەوە تێیدا دەژین، وەکو وڵاتێکی نوێ وایە. ئەم تایبەتمەندیانە زۆر گرنگە و دەتوانێت کەلتووری ئازادانەی خۆی بخوڵقێنێت. لەمەشدا هێندە درەنگ ناکەوێت. ئەم کەلتوورە لەچوارچێوەی خۆپاراستن بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی کۆلۆنی سۆمەرییەکان، زیاتر بەرخودانڤانی خۆجێیی و تایبەتمەندێتی فرە ئەتنیکی جیاواز لەخۆوە دەگرێت. هەربۆیە بەشێوەکی زەق و بەرچاو نەریت و کەلتووری ئیبراهیمی تێیدا رەنگدەداتەوە.

کەلتووری حەزرەتی ئیبراهیم بەرامبەر بە نەمرودی پادشای شاری سۆمەرییەکان، نوێنەرایەتی بەرخودان و جیاوازی دەکات. چیرۆکە بەناوبانگەکەی بت شکاندن و فڕێدانە ناو ئاگر باسی سیمبۆلی ئەم بەرخودانەیە. راستییەکەی زۆر تێکەڵتر و درێژخایەنترە، تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان درێژدەبێتەوە. ئەم کەلتوورە لەناوەڕۆکی خۆیدا دژی بەڕێوەبەرایەتی کۆیلەدارە وشکەکانی سۆمەرییە کە خۆیان وەکو پادشا ـ خوداوەند راگەیاندووە. هەروەها باوەڕی خوداوەندێک بەبنەما دەگرێت کە مرۆڤانەترە، بەرخودان دەکات و لەگەڵ بەرژوەندی تیرە خوجێییەکانی گەل دەگونجێت، پشت بەو باوەڕییە دەبەستێت کە مرۆڤ تەنانەت پادشاکانیش نابن بەخوداوەند. لەم قۆناخەدا تازە بەتازە لە تەوتەمگەرایی تیرەوە هەنگاو بەرەو خوداوەندی شکۆدار دەهاوێشترێت. کاریگەری میتۆلۆژیای سۆمەری لەسەر ئەوەش جێگەی بایەخە. دوورکەوتنەوە لە تەوتەمگەرایی سەرەتایی کۆن، واتە دوورکەوتنەوە لەو چەمکەی کە هەر تیرە و تەنانەت هەر بنەماڵەیەک خوداوەندی خۆی هەبێت، هەنگاونان بۆ یەک خوداوەندی تیرەکان "ئەل" ، واتە پەڕینەوە بۆ قۆناخی خوداوەندی مەزن پێشکەوتنێکە زیاتر بەگوێرەی بەرژوەندییەکانیانە و خزمەتی باشتر بەیەکێتی دەکات. تەوحید واتە چەمکی تاکخودایی کە بەناوی حەزرەتی ئیبراهیمەوە باس دەکرێت، گوزارشتکردنە لەم قۆناخە. بەشێوەیەکی گشتی دەزگای پێغەمبەرایەتی واتای ریفۆرمی ئایینی لەخۆوە دەگرێت. لەو سەردەمانەدا ئەو ریفۆرمە ئایینیانە زۆر واتادارن، تەنانەت بەواتای شۆڕش دێن. پێغەمبەرایەتی بەواتای ئەو دەزگایە دێت، کە هەم بەرامبەر کەلتووری پادشا ـ خوداوەندی سۆمەرییەکان هەم بەرامبەر چەمکی ئایینی تەوتەمپەرستی کۆن، ئەو ئایین و کەلتوورە نوێیە ئاوادەکات کە دەرئەنجامەکانی لەمێژوودا کاریگەرییەکی ئێجگار گەورەی دەبێت. بوونی ئورفا بەناوەندی ئەم دەزگابوونە بەهۆی تایبەتمەندییەکانییەوە راستییەکی دەست لێبەرنەدراوە. قوڵایی مێژووی ئورفای پیرۆز و شاری پێغەمبەران تاوەکو ناو ئەم راستیانە شۆڕدەبێتەوە. رەوشەکانی نکۆلی و لەعنەت کە دواتر سەریانهەڵدا جەمسەرێکی دیکەی دژ بەپێشکەوتنی دیالیکتێکی پێکدێنێت.

بەپێچەوانەی شیمانەکان کەلتووری پێغەمبەرایەتی لەعەرەبستانەوە نەهاتووە. ئورفا و ناوچەکانی دەوروبەری دەزگاکانی باوەڕی نیولیتیک و سۆمەرییەکانیان بەریفۆرمێکدا تێپەرکرد، گۆڕانیان بەسەردا هێنا، لەساڵانی (2،000)پێش زایین بەولاوە وەک راستییەکی مێژوویی بەهەموو لایەکدا لەناویشیاندا لە نیمچە دوورگەی عەرەب بڵاوبوویەوە. بوونی ئورفا بە (وڵات)ی پێغەمبەران بەو واتایە دێت. بەگوێرەی ئەو سەردەمە جۆرێکە لە رێنسانس. لەجیاتی پەرستنی بەندە و بتەکان، وابەستەبوون بەخوداوەندێک کە بەگوێرەی ئەوان یەکسان و ئازادیخوازترە، هەنگاوێکی گرنگ دەهاوێژرێت و واتایەکی مێژوویی گەورەی هەیە.

دواتر قۆناخێکی نوێ دەستپێدەکات. لەناوچەکەدا نەک تەنیا حەزرەتی ئیبراهیم، بەڵکو زۆر لەو لەپێشتر "ئیدریس، ئەیوب، یونس و نوح" هەنگاوی پێکهێنانی ئەم نەریتەیان هاوێشتووە، ئەمانە بەزۆری لەدژی کۆیلەداری سۆمەر ـ بابل ـ ئاشوور بەواتای کەسایەتییە پێشەنگەکانی گەل دێن. تێکۆشانی چینایەتی بەگوێرەی قۆناخ بەڕێوەدەچێت، ئەمانە نوێنەرایەتی ئازادی ئەو تیرە ئەتنیکیانە دەکەن کە پێیانەوە گرێدراون. دەتوانرێت باس لەقۆناخێکی مێژوویی بکرێت. بوونی حەزرەتی ئیبراهیم بەباپیرە گەورەی نەریتەکە، دەستپێکردنی کاریگەری و یەکلاییکردنەوەی ئەو قۆناخە نیشاندەدات، کە گوزارشت لە سەرکەوتن و کاریگەری بەرخودان دەکات.

تا ئەو رادەیە جێگرتنی لەیادەوەری مرۆڤدا بۆ ئەو کۆمەکە گرنگە دەگەڕێتەوە کە بۆ کەرامەتی مرۆڤایەتی پێشکەشی کردووە. پێشتر تەنیا پادشا ـ خوداوەند و چەمکێکی رەهای مرۆڤایەتی کۆیلەکراو جێگای باس بوو. شکاندنی ئەم زهنییەت و بەندایەتییە گەورەترین هەنگاوی شۆڕشگێڕانەی قۆناخی خۆیەتی. شکاندنی بت لەراستیدا بۆ یەکەمین جار وەشاندنی زەبرێکی سەرکەوتوو و بەکاریگەرە بۆ سیستەمی کۆیلایەتی کە لەمێژوودا وێنەی نەبوو و بەهەمیشەیی دەکرێت. پێغەمبەرایەتی نەریتی یاخود گوزارشتی بەدەزگابوونی ئەم پرۆسەیە. هەنگاوەکانی دواتر سەبارەت بەشکۆدارکردنی ئایینی تاکخودایی، پێشخستنی چۆنایەتییەکەی و خۆجێی کردنی دەبێت. قۆناخێک کە هەر کەلتوورێک پێیدا تێپەڕ دەبێت، نەریتی ئیبراهیمیش پێیدا تێپەڕ دەبێت. سەرهەڵگرتنی (کاروانی) حەزرەتی ئیبراهیم بۆ وڵاتی کەنعان (ئیسرائیل ـ فەلەستینی رۆژگاری ئەمڕۆمان) هەم بەهۆی زیادبوونی فشارەکانی سەریەتی، هەم بەهۆی بازرگانییە کە رۆژ لەدوای رۆژ گرنگییەکەی زیاد دەبێت. لەمیانەی ئەم پرۆسەیەی کۆچەوە کە شیمانە دەکرێت لەساڵانی (1،700) پێش زایین روویدابێت کەلتووری پێغەمبەرایەتی لەعەرەبستان بڵاودەبێتەوە. چەندین تیرەی ئاریان ـ هۆری و ئامۆرییە بەرچەڵەک سامییەکان لەنێو جموجۆڵێکی هاوشێوەدان. لەنێوان ناوەندەکانی شارستانێتی سۆمەر ـ میسر بازرگانی دەکەن، دەرفەتی ئاواکردنی میرنشینی بچووک دەبینن. ئەم رەوشەش پێویستی هەبوونی ئایدیۆلۆژی و رێبەری خۆجێیی نیشاندەدات. دابینکردنی پێویستی هەرە گشتگیر لەمیانەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نوێوە جێبەجێدەکردێت کە بە"ئەل" گوزارشتی لێدەکرێت و بەرەو ئایینی تاکخودایی ئاراستە دەگرێت.

ئەو تیرانەی حەزرەتی ئیبراهیم رابەرایەتییان دەکات لەماوەی نزیکەی (400)ساڵدا تاوەکو وڵاتی میسر دەڕۆن، هەوڵدەدەن وەکو کارکەرە عیبرانییە هەژارەکان جێگیربن، (وشەی عیبرانی: لەوشەی ئابیرۆ ـ عیبرۆوە هاتووە کە بەمانای پیاوە تۆزاویەکانی بیابان دێت، بەزمانە میسرییەکان بەواتای پیاوە پیس و تۆزاوییەکان دێت) بەهۆی رەوشی نالەبار و یارمەتیدانی یاخیبوونێک لەساڵانی (1،300) پێش زایین بەڕابەرایەتی حەزرەتی (موسا) کاروانە مێژووییەکەی میسر ئەنجامدەدەن. ئەو کاروانەی شیمانە دەکرێت (40) ساڵ بەردەوام بووبێت، بەنیشتەجێبوون لە ئیسرائیلی رۆژگاری ئەمڕۆ ئەنجامگیر بوو. ئەم نیشتەجێبوونە لەمیانەی پێکدادانێکی دژوار لەگەڵ تیرە خۆجێییەکان بەدیهات. (موسا) لەرێگای دە فەرمانە گرنگ و بەناوبانگەکەیەوە نەریتی ئایینی تاکخوادیی دەگەیەنێتە قۆناخێکی نوێ. لەساڵانی (1،000) پێش زایین بۆیەکەمین جار داود و سلێمان ئەم نەریتە دەگەیەننە ئاستی پادشایەتی. حەزرەتی موساش یەکەمین کەس و پێغەمبەرە کە رۆڵی میللیکردنی ئایینی تاکخودایی دەبینێت. لەسەر بنەمای ئەم نەریتە ئایینییە قەومی یەهودیی دەکاتە یەک. پێکهاتەی پەرتەوازە و بڵاوی تیرەکان کە بەسانایی نایەنە لای یەکترەوە و لە ناوەندێک گرد نابنەوە، لەرێگای گەورەترین "ئەل"ی شکۆدارکراو کە خوداوەند (یەهودا)یە دەترسێنرێن، سەر لەنوێ دەهێنرێنە سەر رێگا.

ئەم چالاکیەش لەمێژوودا ئەنجامی مەزن دەخوڵقێنێت. لەدوای ئورفا بەتایبەتی لەدەوروبەری قودس، دووەمین ناوەندی پێغەمبەرایەتی پێشدەخرێت. شاری قودس کە خۆشی بەواتای پیرۆزی دێت، ناوەڕۆکەکەی خۆی لەکەلتووری ئورفا وەرگرتووە. بەڵام لەمیانەی وەرچەرخانەوە لەجێگیربووندا سەرکەوتوو دەبێت.

ئاواکردنی یەکەمین پادشایەتی، جیاوازی نێوان چەوسانەوە و چەوسێنەر لەگەڵ خۆیدا دێنێت. توێژێکی یەهودییەکان دەوڵەمەند دەبن و دەگەنە ئاستی کاهینی فەرمی، توێژە هەژارەکەیش پەراوێز دەکرێن، ناچاری ئاواکردنی تەریقەتی رکابەر دەکرێن. لەم سەردەمەدا حەزرەتی عیسا کە نوێنەرایەتی هەژارانی دەکرد، دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەسەنییەکان، لەمیانەی پیرۆز( تقدیس)کردنی لەلایەن حەزرەتی (یەحیا)وە هەڵمەتە ناسراوەکەی دەسپێدەکات. قۆناخی (میلاد) کە بەواتای لەدایکبوون دێت، لەڕاستیدا لەمێژووی ئایینە تاکخوداییەکاندا، گوزارشتە لەهەنگاونان لەقۆناخی تیرە و قەوم بۆ قۆناخێکی گەردوونی.

بۆ یەکەمین جارە لەمێژووی ئایینەکان بەبێ جیاوازی کردن لەنێوان تیرە، قەوم و چین حەزرەتی (عیسا) لەمیانەی چەمکی خودای - سیانی مژدەی قۆناخێکی نوێ دەدات. زیاتر لەناو توێژە چەوساوە و هەژارەکاندا دەنگدەداتەوە. فەلسەفەی گریک و یەکێتی سیاسیانەی رۆما، لەمێژە زەمینەی ماددی و هزری پێویستییان ئامادەکردووە. بەشێوەیەکی بابەتی حەزرەتی (عیسا) دەکرێتە سیمبۆڵ، ئایینی کریستیانی لەم سێ سەرچاوەوە تێردەکرێت و وەکو ئایینی نوێ پێشکەوتنی مەزن بەدەست دێنێت. بەکاریگەربوونی تا ئەم ئاستە بۆ ئەم هەلومەرجە لەبارانە دەگەڕێتەوە. هەڵمەتێکە کە هەرمزێدە کاریگەری لەسەر مێژووی جیهان کردووە. رۆڵی حەزرەتی (عیسا) لەدروستبوونی ویژدانی مرۆڤایەتی گەورەیە. هەروەکو دەزانرێت پێش لەخاچدانی بۆ ئورفا بانگهێشت کرابوو، بەڵام ئەو بۆ ئاشکراکردنی ساختەکاری کاهینە فەرمییەکانی یەهودی بە ئاگاییەوە رووی لە قودس کرد. بەراشکاوانە دەتوانرێت بگوترێت؛ ئەگەر ئەم کاروانەی بەرەو قودس نەبووایا ئەوا ئاراستەی مێژوو زەَر جیاوازتر دەبوو. ناوەڕۆکی سەرەکی ئایینی (عیسا) پەیوەندی بەویژدانەوە هەیە. ئامانجەکەشی لەبیر نەکردن، کۆکردنەوە و گەیاندنی مرۆڤایەتی چەوساوە و ئازار چەشتووە بە ئازادی. دوای ئەوەی لەساڵانی (400)ی زایینی دەبێتە باوەڕی و ئایینی فەرمی بێزەنتییەکان، ئیتر ئایینی کریستیانی واتایەکی پێچەوانە لەخۆوە دەگرێت، لەخزمەتی دەوڵەتدا چەوساوەکان بە دەوڵەتەوە دەبەستێتەوە. لەکاتێکدا لایەنە پێشکەوتووخوازەکەی لەکون و قوژبنە تاریکەکان دەمێنێتەوە، لەناوەندی دەوڵەتەکانی شارستانێتیشدا دەکەوێتە ناو کۆنەپەرستییەوە.

سێیەمین هەنگاوی مەزنی وەرچەرخان و خۆجێییکردنی نەریتی ئیبراهیمی کە ئورفا سەرچاوەکەی پێکدێنێت، لەناوەوەی عەرەبستان لەمەککە و دەوروبەری دەهاوێشترێت. ئەم هەنگاوەی کە حەزرەتی محەمەد هاوێشتوویەتی، هەردوو شێوەی یەکەمینی نەریتی ئایینی تاکخودایی، واتە لەڕێگای تێپەڕکردنی هەردوو ئایینی یەهوودی - مەسیحی بەریفۆرمێکی چڕدا، هەڵمەتەکەی ئەنجامدەدات. سێیەمین گۆڕەپانی پیرۆزی لەمەککە و دەوروبەری پێکدێت. پێشتر مەککە و پەرستگاکەی واتە کەعبە ناوەندی (360)بت بوو. هیچ پەیوەندییەکی بەئایینی تاکخوداییەوە نەبوو. ژیانێکی ئایینی سەرەتایی تێکەڵ بەتەوتەمپەرستی جێگای باسە. لەڕێگای حەزرەتی (محەمەد)ەوە ناوەندی سێیەم و قۆناخێکی نوێی مێژوویی دەست پێدەکات. حەزرەتی (محەمەد) لەچوارچێوەی زاراوەی (ئەڵڵا= الله)ی تاک و بێ شەریک کۆکردنەوەی تەواوی تیرە عەرەبە سامییەکان بەبنەما دەگرێت. بەرزبوونەوەی ئاستی بازرگانی، بەهێزبوونی ئیمپراتۆریەتەکانی (بێزەنتی - ساسانی - حەبەشە)ی دەوروبەر، یەکێتی و بەهێزبوونی تیرە عەرەبەکان دەکاتە ناچاری. ئیسلام وەکو ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی نوێ بەرهەمێکی ئەم پێویستییەیە.

بەلاوەنانی رەوشی پەرتەوازەیی، خەسڵەتی دژە ناوەندی ژیانی تیرەکان، پێشخستن و قووڵکردنەوەی زاراوەی (ئەڵڵا) بۆ گەیشتن بەهێزی ناوەندی چالاکییەکەی دەکاتە پێویستییەک. کارامەیی یان گەورەیی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی (محەمەد) لەبینین و وەڵامدانەوەی ئەم پێویستییەدا شاراوەیە. هێندە قووڵ و هەڵمەتکارە بەخێراییەکی بێ هاوتای مێژوویی، رێگا لەبەردەم گەورەترین شۆڕشی دەرەبەگایەتی دەکاتەوە. بەمجۆرە گەورەترین قەڵەمبازی شارستانێتی چاخی ناوین مەیسەر دەکات.

حەزرەتی (محەمەد) کاتێک خۆی بەکۆتایی هاتنی چاخی پێغەمبەرایەتی راگەیاند، هەواڵی بەهێزبوونی چاخی ئەقڵ و تێگەیشتنیشی بەمرۆڤایەتی دا. پێغەمبەرایەتی، زیاتر گوزارشت لە کەسایەتییە پێشەنگەکانی ئەو قۆناخە دەکات کە بۆ رزگاری چاوەڕوانی هێزی ئیلاهی و ئایین دەکات. پەرەسەندنی فەلسەفە و زانست گرنگی ئیلاهیات دەخاتە پلەی دووەمەوە. شێوازی هزری ئایینی زیاتر شێوەی هزری چاخەکانی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتییە. دەرکەوتنی فەلسەفە بەڵگەی بەسەرچوونی ئەم قۆناخەیە لەمێژوودا. حەزرەتی (محەمەد) ئەو پێغەمبەرەیە کە هەرە زێدە راڤەی فکری ئایینی رەچاو کردووە. لایەنە لاوازەکانی ئایینی باش زانییوە. لەسەختی و زەحمەتییەکانی پراکتیکی خۆیەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە چیتر مرۆڤایەتی بە سروش (وەحی) تێرناکرێت. ئەم پراکتیکە لووتکەی هەرەبەرزی هزری ئایینییە. لەمە بەدواوە چاخی کەوتنی هزری ئایینی و سەرەتای سەردەمی ئەقڵە.

بەداخەوە بەهەموو زانا و بیرمەندە ئیسلامییەکانیشەوە کارەکتەری ریفۆرمخوازی ئایینی حەزرەتی (محەمەد)یان راست دەستنیشان نەکردووە، هەربۆیە نەیانکردووە بەخەسڵەتێکی هەمیشەیی: خۆی واتە حەزرەتی (محەمەد) ریفۆرمخوازی هەرە گەورەی ئایینەکان بوو. بەپێچەوانەوە لەئایینی ئیسلامدا رێگایان لەبەردەم گەورەترین موحافەزەکاری کردۆتەوە. ئەو موحافەزەکارییە لەگەڵ کۆچی دوایی حەزرەتی (محەمەد)دا دەستی پێکرد، لەناو قۆناخێکی چەند سەدەییدا لە گۆرستانی رۆژهەڵاتی ناوین کەوتە نێو ریشەدارترین کۆنەپەرستییەوە. ئیتر چیرۆکی هەڵکشاوی (1500)ساڵەی مرۆڤایەتی بەرەو لێژی ئاراستەدەکرێت. لەدوای ئالۆزی و کێشمەکێشەکانی ساڵانی نێوان (800 - 1200)وە ئیتر دواکەوتن، قەیران و هەڵوەشانەوە خێرادەبێت. هێڵکاری هەڵکشانی مرۆڤایەتی لەکیشوەری ئەورووپا، لەرێگای زانستی ئەزموونییەوە سەرەتایەکی نوێ دەستپێدەکات.

بەشێوەیەکی گشتی میزۆپۆتامیا، بەتایبەتی مێژووی ئورفا لەم چوارچێوەیەدا پیرۆزی کۆن لەدەستدەدات و بەپێچەوانەوە دووچاری نەفرەت دێت. وڵاتی پێغەمبەرە پیرۆزەکان ئیتر کەوتۆتە ناو قۆناخی تاریکی و گرگنییەوە. پڕ بەئێشە، بەڵام راستییەکە مێژووییەکی دواکەوتن و خراپی هەروەکو بڵێی چارەنووسە تۆڕی خۆی هۆنیوەتەوە. ئەو خاک و کەلتوورەی گەورەترین کۆمەکی پێشکەش بەشارستانێتی جیهان کردووە، لەلایەن خاوەنە نوێیەکانییەوە دووچاری خیانەت دەبێت.

یەکەمین شەپۆلی خیانەت لە رێگای بنەماڵەکانی (ئەمەوی و عەباسی)یەوە ناوچەکە داگیردەکات. ئاغاکانی شەڕ لەمیانەی دۆگمایەکی ئایینی پووچ و توندوتیژییەکی رووت کە دیاریکەری ئەنجامەکانە، بەبێ ئەوەی هیچ بەها و پرەنسیپێکیان هەبێت وەکو دووپشک دەستیان بەسەرناوچەکەدا گرت. قۆناخەکانی دیکەی داگیرکاری لەدووبارەکردنەوەیەکی خراپتری هەمانشێواز تێپەڕیان نەکرد. ئورفا و شارەکانی دەوروبەری، پڕ دەبن لەو (نەمرود)انەی کە هەزاران جار لەنەمرودەکانی سۆمەر و ئاشور خراپترن. بووکڵەی لەبت خراپتر، هەموو شوێنێک پڕدەکەن؛ قۆناخی دەرەبەگایەتی بەشێوەیەکی سەرتاپاگیری و قووڵ، مرۆڤایەتی دەخاتە ناو نەزانی(جەهالەت) و ویژدانەکەی دەپوکێتەوە. ئیتر قۆناخێکی لەشێوەی"نەعلەتکردن لە ئاکادا" روودەدات. شیوەن، ئاوازی خەمناک، هاوار و تەواوی گۆرانییەکان گوزارشت لەو ئێش و ئازارانە دەکەن کە ئەم نەعلەتکردنە لەگەڵ خۆی هێناوە. تاجی لەعنەت و نکۆڵیکردن دەکەنە سەر پیرۆزی و نەریتی ئیبراهیمی.

کەلتووری زاڵی دەرەبەگایەتی لەم لایەنە تۆڵە لەکەلتووری پیرۆزی مرۆڤایەتی دەکاتەوە. بەرچاوترین بەڵگە ئەوەیە: بچووکترین لێگەڕینی ژنان بۆ ژیانی ئازاد بەتاوان دادەنرێت، گوایە بەبڕیاری ئەنجوومەنی بنەماڵەوە، بەشێوەیەکی دڕندانە بەسەر کچە هەرزەکارە (15)ساڵییەکاندا دەتەقنەوە. ئەو بەناو ناموسەی لە پیاودا چڕبۆتەوە، لەناوەڕۆکدا گەورەترین بێناموسییە، نامۆترین و گومڕاترین ئازادی زایەندی بۆخۆی وەکو مافێک دەستنیشاندەکات، بەڵام لێگەڕینی ژنان بۆ ئازادی مژاری گەورەترین سزایە. ئەم دیاردەیە سەمبۆلیزەکردنی هەموو بوویەرەکانە. لەڕاستیدا ئەم نەفرەتە لەسەرتاسەری ژیاندا جێگای باسە. هەرکەس دەخوازێت لەنهێنی گۆرانی و بیبەری تیژی ئورفا تێبگات. ناوەڕۆکەکەی لەم راستییەدا شاراوەیە. ئەم توێژ و قەتماخە هەزارساڵییەی کۆنەپەرستی، لەمیانەی

رووپۆشی سەدەی بیستەمی سەرمایەدارییەوە دژوارتر و وێرانکەرتر بوو. لەرێگای چەپەڵترین هاوسەرگیری سەرمایەداری و دەرەبەگایەتییەوە خوازیارن رێگا لەبەردەم رەوشێکی بنبەستوو بکەنەوە کە رزگاربوون لێی ئاستەمە.

کەچی ئەم رووپۆشە هەڵدرێتەوە و بکۆڵدرێت، دەبینرێت کە لەژێر هەر تۆزقاڵێکدا مرۆڤایەتییەکی راستەقینە شاراوەیە. مەدالیا دووڕووی بەمجۆرەی هەیە. روویەکیان، ئەو دەزگا، رۆح، زهنییەت و پێکهاتە لەعنەتیانەن کە پشت بەڕزاندن، وێرانکردن و نکۆڵیکردنی تەواوی بەها رەسەنەکان دەبەستێت، رووەکەی دیکەشی، بەدەزگابوونی پیرۆزی پێغەمبەرایەتییە، کە لەمیانەی رۆح و زهنییەت و بەها راستییەکانی مرۆڤایەتییەوە هەن. زۆر سەخت و بەئێش و ئاڵۆزە، بەڵام رووبەڕووی دیالیکتیکێکی مێژوویی تایبەت بەخۆی بۆتەوە. سەرەکیترین پرس کە پێویسی بەشیکارکردن هەیە، ئەو پەیوەندییە دیالیکتیکیانەیە. ئەمەش یەک رێگای هەیە. ئەویش بەهەموو هەستیارییەکەوە بەزانستییوندا تێپەڕدەبێت.

هەرچەندە (PKK) ئاگاداری قووڵایی تێگەیشتنەکەی نەبێت، بەڵام لە واقیعی ئورفا بەم تاقیکردنەوەیە هەستاوە. راستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە نیازی(PKK) لایەنگیریکردنی ئازادی و رۆشنگەرییە. ئەنجامدانی یەکەمین چالاکییەکانی لەجیاتی دامودەزگاکانی کۆمار ، بەرامبەر پێکهاتەی پاشڤەڕۆیی دەرەبەگایەتی، بەڵگەی سەلمێنەری ئەم راستییەن.

لەم لایەنەوە ئایا دەتوانرێت بگوترێت کە (PKK) بزوتنەوەیەکی ئیبراهیمی هاوچەرخە؟ لەبواری نیازدا لایەنی هاوشێوەی زەق و دیار بەرچاو دەکەوێت. هێرشکردنە سەر زەمینەی نەعلەتی و نەمرودە بچووکەکان نەک تەنیا بەناوی نەتەوەیی و دیموکراتییەوە، بەڵکو بۆ مرۆڤایەتیش هەنگاوێکی پێشکەوتوخوازییە. ئەمە لەگەڵ کۆماریبوون ناکۆک نییە. پێویستییەکی سروشتەکەیەتی. کۆمار ناچارە لەدژی دەرەبەگایەتی بێت. ئەگەر نەیەوێت بەساختە بەناوبکرێت (واتە کۆمار) و ، بەراستی لەسەر راستەڕێی کارەکتەری عەلمانی و دیموکراتی خوازیاری پێشکەوتن بێت، ئەو کاتە دەتوانرێت بگوترێت کە (PKK) و کۆماری تورکیا بەڕێککەوتنێکی سروشتی گەیشتوون. ئەو رێککەوتنە بابەتییەی لەساڵی (1920) بەمتمانەیی لەنێوان کورد ـ تورک پێشکەوت، لەناوچەکانی (عەنتاب، مەرعەش و ئورفا) واتایەکی بەمجۆرەی هەیە. ئەم رێککەوتنە خاوەن ناوەڕۆکێکی برایانەی ئەوتۆیە کە بۆ هاوچەرخی و ئازادی کراوەیە. پەیرەونەکردنی حقوقی برایەتی بەهۆی یاخیبوون و ئەوپەڕگەری نەتەوەپەرستی، بێ شانسییەکی گەورەیە. ئەمەش رێگرتنە لەبەردەم پێشکەوتنی قۆناخێکی مێژوویی گرنگ، لەهەمانکاتدا شانسێکی نوێی ژیانە بۆ دەرەبەگایەتی.

لەم لایەنەوە (PKK) لەکارەکتەری ئازادی و برایەتی کۆمار دەگەڕێت. چەندە ئەمەی لەمیانەی هۆشیاری و کارامەیی سیاسی ئەنجامداوە، لایەنێکە پێویستە هەرەزێدە رەخنە بکرێت، بەڵام لەقەڵەمدانی تەواوی ناوەڕۆکەکەی بەجوداخوازی نرخاندنێکی ئەوپەڕگەرییە. (PKK) تاوەکو سمحاق( مۆخ)ەکانی ئێسکی ئەو دروشمەی هەرسکردووە کە دەڵێت: " ئازادی نەبێت، یەکێتی نابێت". بەڵام ئەگەر بگوترێت لەهەموو هەلومەرجێکدا لایەنگری دەوڵەتێکی میلیگەرایی کوردی جیاوازبووە، مسۆگەر ئەمە پەسەند ناکرێت. ناتەواوی و هەڵەکەی ئەوەیە کە رێکخستن و چالاکییەکی گونجاوی بەگوێرەی یەکێتی ئازادانە و بەرێبازێکی راست و کارامە بەرێوەنەبرد. لەکاتێکدا دەرفەتی ئەمەش هەبوو. جددیترین بزووتنەوەیە کە بەبێ پەنابردنە بەر توندوتیژی، بەتایبەتیش توندوتیژییەک کە بەرگری رەوا تێپەڕبکات، لەسەر ئەم رێگا راستە دەتوانێت گەورەترین خزمەت بۆ کۆمارێکی دیموکراتی و عەلمانی بکات. مەگەر (PKK) لەم خاڵەدا تاوانبار و رەخنەبکرێت. ئەگەر نا لەبواری نیاز، هەوڵ و فیداکاری لەسەرووی ئەو دیاردانەوە دێت کە بۆ ئورفا و ناوچە هاوشێوەکانی، پاڵێوراوە بۆ ئەوەی لەم سەدەیە ببێتە بزوتنەوەیەکی راستەقینەی پیرۆزی.

دووبارەکردنەوەی ئەو بابەتانە بەپێویست نابینم کە بەگشتی بەناوی (PKK)وە ئاماژەم پێکردووە. تەنیا ئەوە دەڵێم کە بۆ ئورفاش لەجێگای خۆیدایە. ئەوەی بۆ ئورفا و دەوروبەری گرنگە، ئایا (PKK) لەسەدەی بیست و یەکەم دەتوانێت هەنگاو بۆ پیرۆزییە هەنووکەیی و نوژەن کراوەکانی ئیبراهیمی بهاوێژێت یان نا. خاڵی بایەخدار ئەوەیە: ئەو وەرچەرخانەی (PKK) ئەنجامیداوە ئەو هۆشیاری و ویژدانەی بەدەست هێناوە کە بۆ ئەم بزووتنەوەیە پێویستە. دەبێت زۆر بەڕاشکاوانە ئاماژە بەوە بکەم کە بەناو و ناسنامە کۆنەکەی ناتوانێت ئەم وەرچەرخانە لەناوچەکەدا ئەنجامبدات و لەلایەنی مێژوویشەوە بەوشێوەیە. دیسان ڕاشکاوانە ئەوەش بڵێم کە کۆماری تورکیا لەڕێگەی چەمکی ڕێککەوتنی کۆن لەگەڵ دەرەبەگایەتی ناتوانێت ڕەوابوون(مەشروعییەت) بەخۆی بدات. کۆمار تەنیا لە میانەی گەڕانەوە بۆ ڕۆحی هاوبەشی ڕزگاری نیشتمانی و یەکێتی ئارەزوومەندانەی ساڵی (1920) و چالاکبوونی هاوچەرخانەی کۆماری دیموکراتی دەتوانێت ئەم ڕەوابوونە بەدەست بێنێت. لەڕێگای گواستنەوەی پێکهاتەی دەرەبەگایەتی بۆ سەدەی بیست و یەکەم و قەدەغەکردنی هەبوونی کەلتووری و مافی خۆگوزارشکردنیان تەنیا زەمینە بۆ جوداخوازی ئامادە دەکرێت. یەکێتی بەهێز بە بەرژەوەندی هاوبەش و ئازادیدا تێپەڕ دەبێت. دەشێت ئەم ڕاستینە یەکێتییەکی برایانە لەئێش و ئازاری ئەم بیست و پێنج ساڵەی دوایی فەراهەم بکات. توندوتیژی و گومانی دوولایەنە و نکۆڵیکردن، لەژەهراویکردنی زەمینە و ڕێگاکردنەوە لەبەردەم شەپۆلی نوێی توندوتیژی بەولاوە هیچ شتێکی دیکە لەگەڵ خۆی ناهێنێت.

هەروەکو تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوین و تورکیا، ئورفا و دەوروبەریشی کە یەکێکە لەناوچە گرنگەکان تەنیا کاتێک پێودانگە هاوچەرخەکانی دیموکراتی پەسەند بکات، ڕابردووی خۆی لەمیانەی ئەم پێودانگانە نوژەن و زیندوو بکاتەوە، دەتوانێت سەرلەنوێ بکەوێتە قۆناخی لەدایکبوونی ئازادانە. کاتێک لەگەڵ دیموکراتیزەبوونی گشتی لەنێو پەیوەندییەکی پتەو جموجۆڵ بکات، دەشێت خاوەن ڕۆڵێکی شایستەی مێژوو بێت. لێشاوی ئاودێری ڕووباری فورات بۆ دەشتەکان زەمینەیەکی ماددی بەهێز بۆ هەڵمەتێکی نوێی شارستانێتی پێشکەش دەکات. هەرلەئێستاوە ئاشنابوونی بەپێشکەوتووترین تەکنەلۆژیا لەڕێگای شارستانێتی دیموکراتیدا گوزارشت لەهەنگاوی مەزندەکات. بەکاریگەرترین کۆسپ لەبەردەم دیموکراتیزەبوون، زهنییەتی دەرەبەگایەتی و دامودەزگاکانی، لەگەڵ نەگەیشتنی کۆمارە بەمیکانیزمێکی تەواوی دیموکراتی و عەلمانی.

لەقۆناخی داهاتوومان‌دا لەکاتێکدا (PKK) خۆی نوێ دەکاتەوە، تەنیا کاتێک کەموکورتییەکانی بەلاوە بنێت دەتوانێت کاریگەری هەبێت. پێویستە (PKK) خۆی لەگەڵ بەدەزگابوونێکی یاسایی و دیموکراتی بگونجێنێت. لەمیانەی پرۆژەیەکی بەرفراوانی کۆمەڵگای مەدەنی، دەتوانێت گرنگترین و بایەخدارترین کۆمەک بەئاشتی و دیموکراتیزەبوون بکات.

بۆ ئورفا و دەوربەری پرۆژەکانی کۆمەڵگای مەدەنی گرنگییەکی ژیانیان هەیە. لەڕێگای چەمکی دەوڵەت کۆمەڵگای کلاسیک نەک هەر تەنیا پێشکەوتن بەدەست ناهێنرێت بەڵکو تەنیا خزمەت بەکۆنەپەرستی و موحافەزەکاری دەکرێت. ئەگەر کۆمەڵگا بەهەموو شێوەیەک بکەوێتە خزمەتی دەوڵەت، یان بەپێچەوانەوە دەوڵەت بەتەواوی بکەوێتە خزمەتی کۆمەڵگاوە ئەوا ئەم شێوازە هێندە دەرفەتی پێشکەوتن و وەرچەرخان نادات. چونکە ئەم پەیڕەوە کە لەدەستپێشخەری تاکەکەسی بێبەشە، پشت بەدامەزراوە هاوچەرخەکانی ڕێکخراوی مەدەنی نابەستێت، خولقکار نییە. بەردەوام چەمکێکی سیاسی شێوازی بەرژەوەندیپەرستی لەڕۆژەڤدا دەهێڵێتەوە. هەڵبەتە بەرژوەندیپەرستی دژی خوڵقکاری و بەرهەمهێنانە. ژمارەیەکی زۆری دامودەزگا هەمئاهەنگەکانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی کاتێک لەتەواوی گۆڕەپانەکانی کۆمەڵگای ئەلتەرناتیفدا لەدەوربەری پرۆگرامێکی تایبەتدا ڕێکبخرێن و لەمیانەی چەمکێکی ڕاستی کارکردن جموجۆڵ بکەن، دەتوانن ناوچەکە بخەنە ناو پرۆسەی دیموکراتیزە بوونەوە. گەشەپێدانی ماددی پێویست بۆ پرۆژەی (گاپ)، تەنیا لەڕێگای پرۆژەیەکی بەمجۆرەی دیموکراسی بەواتای

راستەقینەی خۆی دەگات. دیموکراتیزە بوون و پەرەسەندنی ماددی وەکو گۆشت و نینۆک گرێدراوی یەکترن، ئەگەر بەیەکەوە پێشبکەون دەتوانن رێگا لەبەردەم ئەنجامی تەندروستانەتر بکەنەوە.

لەحاڵەتێکی بەمجۆرەدا کاتێک بۆ دواوە بگەڕێینەوە و سەیرێکی ئورفای سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم بکەین لەرۆژی ئەمڕۆماندا چی دەبینین؟

کاروانەکەی حەزرەتی ئیبراهیم بەرەو وڵاتی کەنعان بووەتە سەرەتای گۆڕانکارییەکی مێژوویی مەزن. ئایینی تاکخودایی، دونیای ئەخلاق و باوەڕی پشتبەستوو بەئەڵڵای بۆ کەلتووری پێغەمبەرایەتی ئافراندووە. لەسەر ئەم بنەمایەش کاریگەری لەسەر تەواوی مێژووی مرۆڤایەتی کردووە. ئەو مرۆڤایەتییەی لە ئورفا و دەوروبەری لەدایک بووە لەمیانەی گەردوونییوونییەوە سەلماندوویەتی کە شایستەی پێشەنگایەتییە. ئەمڕۆ لەرەوشی هەرە دواکەوتووی نەعلەتیدایە، رووبەڕووی رێنسانس و لەدایکبوونێکی نوێیە. ئەو ئەرکانەی کۆمار جێبەجێی نەکرد، (PKK) خستییە سەرشانی خۆی و هەوڵی جێبەجێکردنی داوە، بەڵام ناتوانرێت بگووترێت کە بەتەواوی سەرکەوتنی بەدەستهێناوە. سەرکەوتن تەنیا لەمیانەی کاراکردنێکی راستەقینەی پرەنسیپەکانی کۆماری دیموکراتی و عەلمانی؛ ئەویش لە حاڵەتێکدا مسۆگەردەبێت کە لەناو زەمینەی ئاشتی بەرۆحێکی برایانە جموجۆڵ بکرێت و هەوڵوکۆششێکی هاوبەشی بۆ بدرێت. لەمیانەی وابەستەبوونێکی دڵخوازانە بەیادەوەرییە تازەکانی (1920) کە یەکەمین و بنەڕەتی ترین رێککەوتنە، پێویستە جارێکی دیکە لەنێوان گەلی کورد و تورک نوێبکرێتەوە. رێککەوتنێک کەپشت بەیەکێتی ئازادانە ببەستێت و ئازادی رادەربڕینی هەبوون و پێکهاتە کەلتووریەکان بەبنەما بگرێت ئەمە رێککەوتنێکی راستەقینەی چارەنووسسازە.

رۆژبەرۆژ گرێدانی گۆڕەپانی نێودەوڵەتی بۆ ناوچەکە زیاتر دەکات. شرۆڤەکردنی هەموو ئەمانە وەکو ئامانجێکی داگیرکاری چەوتە، بەڵام هەرگیز ئەوەش لەبیر ناکرێت کە لە سەردەمی سۆمەرییەکان بەدواوە بەردەوام پەرەسەندنی کۆلۆنیەکان جێگای باس بوو. راستترین هەڵوێست ئەوەیە کە پەیوەندی نێودەوڵەتی بەگوێرەی پێودانگی بەهاکانی شارستانێتی دیموکراتی تاوتوێ و پەسەندبکرێت ، و هاوکاری و هاوبەشی پێشبخرێت. لەم رێگایەوە ئەو راستییە دەسەلمێنرێت کە ئورفا و دەوروبەری دەتوانن ببنە ناوندی شارستانێتییەکی (بان نەتەوەیی) و شکۆدارییەکی شایستەی مێژووەکەی؛بەم ئامانجە سەرلەنوێ خاوەندارێتی لەناوچەی لەدایکبوونی شارستانێتی دەکرێت. رێگا لەبەردەم دەستپێکێکی سەرکەوتووانەی شارستانێتی دەکاتەوە و لەسەردەمی خۆیدا، جارێکی دیکە برەو بەو پێشکەوتنانە دەدات کە کاریگەری لەسەر تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین دەکات.

ئەو پێکدانانەی لەنێوان تیرەی عیبرانی و تیرە سامییەکانی دیکە لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمەوە دەستیپێکرد، ئەمڕۆ بەشێوەی پێکدادانی عەرەب - ئیسرائیل بەردەوامدەکات. چەندەی دەکرێت لایەنەکان ئاشتنابنەوە. هۆکاری ئەمەش دوورکەوتنەوەیانە لەناوەڕۆکی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم. ئورفا و دەوروبەری لەچارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییە مێژووییەشدا دەتوانن رۆڵ ببینن. کێشەکانی مرۆڤایەتی لەو شوێنانەی لێی لەدایکبوون، واتە لەلانکەیان بەچارەسەری واتادارەگەن. هەر لەکۆنەوە بانگەشەی عەرەب و ئیسرائیلییەکان دەرهەق بە خاوەندارێتی ناوچەکە کەم نەبۆتەوە. تاکو ئێستاش عەرەبەکانی (حەران) راستییەکن. ئیسرائیل لەرێگەی پرۆژەی گاپەوە، تەکنۆلۆژیا و سەرمایەی دارایی جیهانی داوەتە پشتخۆی، هێدی هێدی لەناوچەکە جێپێی خۆی دەکاتەوە و جێگیر دەبێت. سەرمایەی عەرەبەکانیش لەناو هەنگاوێکی هاوشێوەدان. هەردووکیشیان لەناو تورکیا هاوپەیمانی بەهێزیان هەیە، بۆ پەیوەندی بەکاریان دێنن. بەڵام دەبێت لەئێستاوە بزانن هەوڵەکانی کۆلۆنیکردنی شێوازی سۆمەرییەکان بێ واتایە. ئەگەر گەل برسی و بریندارە، نابێت بەگوێرەی ئەوە خۆیان بخەنە ناو خەیاڵی خاوەوە. راستتر ئەوەیە

بکەونە سەر راستەڕێیەک کە پێکەوە ژیان و ئاشتی نێوان تەواوی گەل و کەلتوورەکان بەبنەمابگیرێت و لەمیانەی پێوانە دیموکراتییەکان لەچارەسەرکردنی کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوین بگەڕێن، لەسەر بنەمای ئەم چەمکە بێنە ناوچەکەوە.

گەلی ئاشووری و ئەرمەنیش رەنجێکی زۆریان بۆ ئەم ناوچەیە داوە. پێویستە لەمیانەی رێزێکی گەورەوە پێشوازی لە پەیوەندییان بۆ ناوچەکە بکرێت. ئاشووری و ئەرمەنییەکان لەکەلتووری ئورفادا شوێنپەنجەیەکی ئەوتۆیان هەیە، کە ئاسەوارەکانی ناسڕدرێتەوە. لەحاڵەتێکی وەهادا هاوکارییەکی شارستانێتی دیموکراتی نێونەتەوەیی (ئەنتەر ناسیۆنال)، تەنانەت بان نەتەوەکانیش کە پشت بەتەواوی ئەم ئەندامە رەسەنانە ببەستێت، هەم گەیشتن بەسەردەم لەگەڵ خۆی دێنێت، هەم ئەو دیموکراسییە سەرەتاییەی کە لەسەردەمی کۆمەڵکاری کشتوکاڵی نیولیتیکەوە لەدەستدراوە بەدەستدەخرێتەوە، بەمجۆرە لەئاستێکی بەرزدا دەتوانێت بیکات بەپارچەیەکی گرنگی سەنتێزی شارستانێتی نوێ. جارێکی دیکە لەم رێگایەوە نەریتی حەزرەتی ئیبراهیم لەناو پێوانە هاوچەرخەکان دەتوانێت گەردوونی بێت، بۆ گەنجینەی هاوبەشی مرۆڤایەتی وەرچەرخێت. لەسەر ئەم بنەمایە ئورفا و رۆژهەڵاتی ناوینی نوێ دەگەنە پێگەیەک کە هاوشان و شایستەی رۆڵی مێژووییان بێت.

وەکو ئەنجام کەلتووری پێغەمبەرایەتی و نەریتی ئیبراهیمی کە حەزرەتی ئیبراهیم بەباپیرە و دامەزرێنەرەکەی دادەنرێت، شرۆڤە و کرداری هاوچەرخ دەکاتە پێویستییەک و جێگای بایەخ پێدان. کاتێک پێگەی ئورفا و دەوروبەری لەناو مێژووی مرۆڤایەتی بەشێوەکی راست خرایەڕوو، ئەوا دەرفەتی نرخاندنێکی رۆشنتر بۆ رۆژگاری ئەمڕۆشمان دەرەخسێت. تاوەکو شیکارییەکی راست بۆ مێژوو نەکرێت ناشێت رێنمایی و دیدگای واتادار سەبارەت بەداهاتوو پێشکەشبکرێت.

ناوچەکە تاوەکو ئێستا گرنگییەکی زۆر دەداتە کەلتووری پیرۆزی؛ پێغەمبەرایەتی و نەریتی ئیبراهیمیش کە پارچەیەکی ئەم کەلتوورەن، هەموویان سەرچاوەکەیان بۆ شۆڕشی کشتوکاڵی دەگەڕێتەوە، کە بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا لەو ناوچەیە پێشخرا. شوێنپەنجە قووڵەکانی ئەم سەردەمە لەناوچەکەدا هەیە و تاوەکو ئێستاش لەئارادانە. پیرۆزی رەنگدانەوەی ئەم راستینەیە، لە دونیای رۆحی و هزریدا. پێگەیاندنی ئاژەڵ و رووەک ناوەڕۆکەکەی پێکدێنێت، بەمجۆرە بۆ یەکەمین جار گوزارشت لەهەست و هزری گەیشتن بەسەرچاوە دەوڵەمەندەکانی خۆراک دەکرێت. لەسەر ئەم بنەمایەش رێگا لەپێش میتۆلۆژیا و هزری ئایینی و رەفتارێکی ئەخلاقی دەکاتەوە.

دەسەڵاتدارێتی سۆمەر کە یەکەمین کۆمەڵگای چینایەتییە و لەسەر بنەمای زێدەبەرهەم ئاواکراوە، کاتێک وەکو کۆلۆنییەک پەرەی سەند، کاردانەوەی خەڵکی ناوچەکە لەشێوازی بەرخودانی پێغەمبەرایەتی و دەزگابوونی بووە، وەڵامدانەوەیەک بووە، ئاسەواری قووڵی لەمێژوودا بەجێهێشتووە. پێشهات و گۆڕانکارییەکانی دواتر لەمیانەی ئەم دیالیکتیکە مێژووییەوە بەڕێوە دەچێت. رەفتارەکانی کۆلۆنیکردن کە بە سۆمەرییەکان دەستی پێکرد و تا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان بەردەوامە، ئەم رەفتارە لەناوەڕۆکی خۆیدا لەگەڵ کەلتووری پیرۆزیدا ناکۆکە. لەکاتێکدا یەکێکیان پشت بەڕەنج، ماندووبوون، هاوکاری و برایەتی قووڵ و واتاداری مرۆڤایەتی دەبەستێت، ئەویتریان پشت بەدەستبەسەرداگرتن، هەژموونگەرایی، ستەمکاری و فشار دەبەستێت. مێژوو لەسەر بنەمای ئەو ناکۆکییەوە هەوڵیداوە یەکێک لەکانگا قووڵەکانی پێشکەوتن شیکاری بکات. کە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تووشی بێچارەیی و بنبەستبوونێکی تەواو هاتووە. ئەو بزاوتەی بە ناوی ژیان دەکرێت، پاشکەوتنێکی مەزنی رۆحی و هزری گەنده ڵ لەخۆوە دەگرێت.

ئەم راستینە سەرلەنوێ لەدایکبوون و رێنسانس دەکات بەناچاری. رەنگدانەوەی شارستانێتی دیموکراتی هاوچەرخ لەسەر ناوچەکە دوورە. ئەو کاریگەریانەی لەدەرەوە هاتوون، بەتایبەتیش ئەوەی لەڕێگای پڕۆژەی گاپەوە هاتووە لەدووبارەبوونەوەیەکی نوژەنی کۆلۆنیگەرایی سۆمەری بەولاوە هیچ واتایەکی

دیکە نابەخشێت. سەرمایەی عەرەب و ئیسرائیلی کەلەهەمان ڕەچەڵەکی سامین و لەگەڵ یەکتر لەنێو پێکدادانێکی دژواردان، هەروەکو لەمێژوو ڕوویداوە دیسان بەهەمانشێوە هەوڵی فەتحکردنی ناوچەکە دەدەن، لەڕێگای بەکرێگیراوە بەهێزەکانیانەوە هەنگاو هەنگاو بەرەو پێشەوە دەڕۆن.

بۆرژوازی تورک وەکو هێزی دەسەڵاتدارێتی سیاسی و سەربازی ناوچەکە، تاوەکو ئێستا وەک خوازیارە پاوانی ئابووری خۆی ئاوانەکردووە. لەڕێگای تۆڕێکی بەرفراوانی هاوپەیمانە دەرەکییەکانەوە هەوڵی پەرەپێدانی ئەم سیستەمە ئابوورییە دەدات. کوردان کە گەلێکی ڕەنجدەری (15000) ساڵەی ناوچەکەن بەتەواوی هەوڵی پەراوێزکردنیان دەدرێت. کەچی کوردان هێزێکی سەرەکی ئەتنیکی، کەلتووری، کۆمەڵایەتی و ئابووری ناوچەکەن. دەبێت باش بزانرێت کە بەزۆرەملێ و بێدڵی ئەوان تەنانەت چەوساندنەوەی هاوچەرخانەش سەرناگرێت. نابێت لاوازی، دواکەوتوویی و چەواشەکاری هۆشیارییەکەی و ڕەوشی بێ ڕێکخستنی کەلە ئارادایە هیچ کەسێک فریوبدات. دیسان ئایینگەرایی ساختە و تەریقەتەکان بەخێرایی هەڵدەوەشێنەوە، ئەمانە ئەو دەزگایانە نین کە بەرەی داگیرکاری ـ چەوسانەوە بتوانێت بۆ ماوەیەکی درێژخایەن پشتیان پێببەستێت.

بەناویەکداچوونی نزیکەی (1000) ساڵی گەلی کورد و تورک لەناوچەکەدا ڕاستییەکی دیکەیە. ئەم بەیەکەوە ژیانەی بەناویەکدا چووە و پشت بەیەکێتی ئازاد و ئارەزوو مەندانە دەبەستێت، کۆمەکێکی گرنگی بەهەڵمەتی ڕزگاری نیشتمانی ساڵی (1920)ی دژبە ئیمپریالیزم کردووە. ڕاگەیاندن و بەدەزگابوونی کۆمار کە یەکێک لەهەنگاوە قووڵ و یەکەمینە شۆڕشگێڕییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوینە، بەهۆی یاخیبوونەکان و پشتبەستنی کۆمار بەدامودەزگاکانی هێزی کاراکردنی وەرچەرخانی دیموکراتیانەی نیشاننەداوە کە لێی چاوەڕوان کراوە. دیاردەی (PKK) کاردانەوەیە لەبەرامبەر ئەم ڕەوشە. ئەم پرۆسەیە کە ڕێگای لەبەردەم قۆناخێکی پڕلەئێش کردەوە، نەک جودابوونەوە، بەڵکو هەوڵدانێکە لەپێناو یەکێتییەکی ئازاد و هاوچەرخانە.

گرنگترین وانەی پێویستە لەدۆزی (PKK)ی ئورفا بەدەست بخرێت، دوورکەوتنەوەی دوولایەنەیە لەو ڕەفتار و کردەوانەی کە توندوتیژی و جوداخوازی دەوروژێنن، بەخێرایی ئەو هەڵسوکەوت و جموجۆڵانە بکرێنە ڕۆژەڤ کە بەڕاستی خزمەت بەبرایەتی و یەکێتی ئازادانە دەکات. ڕێگای ئەمەش پێشکەشکردنی نرخێکی گەورەیە بەزەمینەی ئاشتی، ڕێگادانە بەگوزارشتی ئازادانەی هەبوون و پێکهاتە کەلتوورییەکان و ناسینیان (اعتراف) و بەبنەماگرتنی پێوانەکانی شارستانێتی دیموکراتی بۆ چارەسەرکردنی تەواوی کێشەکان. ئاشکرایە کە ئەم هەڵوێستە پێویستیەکی پێکهاتەی ڕاستەقینەی عەلمانی و دیموکراتیانەی کۆمارە.

ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆی تەواوی ئەندامە هۆشیارەکانی گەلی کورد و تورک، لەسەرووی هەمووشیانەوە (PKK)، ئەوەیە؛ لەسەر بنەمای پشتبەستن بەپرۆژەیەکی بەرفراوانی کۆمەڵی مەدەنی و لەپێناو کۆمارێکی دیموکراتی وعەلمانی بەهەموو هێزی خۆیانەوە بژارێکی چارەسەری پێشبخەن و پراکتیزەی بکەن. هێندەی بڕواکردن بەو ڕاستییەی کە ئەمە ڕاستترین ڕێگا چارەیە، دەبێت ئەوەش باش بزانرێت کە ڕێگا و پێڕەوەکانی دەرەوەی ئەمە جوداخوازی، توندوتیژی، نکۆڵی و ئێشوئازار لەگەڵ خۆی دێنێت و لەبنبەستبوون بەولاوە هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێناکەوێتەوە. لەسەر ڕێبازێکی ڕاستی چارەسەری هەموو شتێک، گرێدراوی وەرچەرخانی ئێشوئازارەکانی ڕابردووە بۆ هێز و هۆشیارییەکی ئازادانە؛ ئاواکردن و سەرخستنی بزووتنەوەی ئاشتی و سەفەربەرییەکی گەورەی دیموکراتییە لەپێناو خوڵقاندنی ئاییندەیەکی پڕلەهیوا.

کەواتە لەچوارچێوەی ئەم پێناسە کورتەی کێشەی سەرەکی ناوچەکە و ڕێگای چارەسەرکردنی شرۆڤەیەکی هاوچەرخانەی حەزرەتی ئیبراهیمی بەچ واتایەک دێت؟

1- بەرلەهەموو شتێک ئایینە تاکخوداییەکان بەگوێرەی ناوەڕۆکەکەیان پێویستیان بەلێپرسینەوەیەکی قووڵ هەیە. ئەمەش لەپێناو ئازادی و نزیکبوونەوەیەکی زیاترە لەراستینەی ئایینی ئیبراهیمی. چونکە بوون بەناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی کە بەرژەوەندی تەواوی چینە دەسەڵاتدار و چەوسێنەرەکان داپۆشێت، بەواتای ئایینی ئیبراهیمی نایەت. لەسەر ئەم بنەمایە؛ عیبادەتکردن لە مزگەوت، کڵێسا و کەنیست لەناخەوە بەواتای وابەستەبوون بەحەزرەتی محەمەد، عیسا و موسا نایەت. ئەو پێغەمبەرانە کەسانێکن کە لەسەردەمی خۆیاندا شرۆڤەی عەقڵانی و رەفتاری ئەخلاقییان گەیاندە لووتکە. بەراستی گرێدان و رێزگرتن لەپێغەمبەران بەواتای بەهاپێدان و بە بنەماگرتنی ئەخلاقی ئازاد و هێزی ئەقڵانی هەرە پێشکەوتووی سەردەم و جێبەجێکردنی پێویستییەکانی دێت.

2- هەربۆیە عیبادەتی راستەقینە ئەو کردارانە نییە کە هەزاران ساڵە دووبارە دەکرێتەوە و واتای خۆی لەدەستداوە، لەشوێنی عیبادەت چەند بارەبکرێتەوە، بەڵکو چەندەی بۆت دەکرێت نرخ و بەها بەزانست، ئازادی و هونەر بدەیت، لەمیانەی وابەستەبوون بەم راستیانەوە ژیانی تاک و کۆمەڵ رێکبخەیت. گەورەترین عیبادەت بەرزاڵکردنی زانست، ئازادی و هونەر لەناو هەموو بوارەکانی ژیانی تاک و کۆمەڵگادا تێپەڕدەبێت.

3 - ئیتر مەرجەکانی باوەڕمەندی (ئیمان) لەپێوانە کلاسیکەکانی لەجۆری نوێژ، رۆژووگرتن، قوربان(حەج)، زەکات و کەلیمەی شەهادە زیاتر، لەرێگەی زانستەوە گەیشتنە بەفەلسەفەی دیالیکتیک، لە ئەخلاقیشدا هۆشیاری و رەفتاری ئازادی، لەهونەریشدا گەیشتنە بەچەمکی جوانی و بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە جێبەجێیکردنی پێویستییەکانییەتی. ئیتر پێشەنگایەتیکردن و نیشاندان و فێرکردنی رێگاکانی لەمزگەوت، کڵێسا و حەوراکان لەچاخە راستەقینەکاندا پشت بە بنەماگرتنی ئەم راستیانە دەبەستێت. خنکاندنی لەنێو رەفتارو هەڵسوکەوتە بێواتاکان، بەواتای ناکۆکبوون لەگەڵ ناوەڕۆکەکەی (ئیمان) دێت.

4- عیبادەتی راستەقینە ئەوەیە کە لە گۆڕەپانی ئەرکی پراکتیکی و بەرجەستەدا بەقووڵایی فێری پێوانەکانی شارستانێتی دیموکراتی بیت، لەپێناو جێبەجێکردنی پێویستییەکانیشی هەوڵبدەیت، بەباوەڕی و شێوەیەکی کارامە تەواوی هێزی خۆت بخەیتە گەڕ. ئیتر بانگهێشتکردنی خەڵک بۆ ئەوەی بەیانی و ئێوارە لەسەر بەرماڵ کەلیمەی شەهادە دووبارەبکەنەوە و ئەمە بەمەرجی سەرەکی ئیمان و جێبەجێکردنی ئەرکەکان دابنرێت، بەواتای وابەستەبوون بەئایینی ئیبراهیمی راستەقینە نایەت. شتێک کە واتاکەی نەزانی و لەبەرزترین ئاستدا پەیوەندی بەژیانی هەنووکەوە دروست نەکەیت و لەدەزگابوونیدا سەرکەوتوو نەبیت، ئایینە ئیبراهیمییەکان ئەمە وەکو ئیماندار و عیبادەتکردن پەسەند ناکەن. فێربوونی قووڵترین هزری زانستی و فەلسەفەی هەنووکەیی و سەردەم؛ وەکو پیرۆزترین کاروکردار دەستنیشانکردنی رەفتاری ئازاد و لەرێگای هونەرەوە گەیشتنە بەجوانترین گوزارەکانی ژیان، ئەمە بەواتای ئەندامێتی ئایینی ئیبراهیمی راستەقینە دێت.

5 - لەم پێناوەشدا بۆ ئەوەی ببیت بەخاوەن کردار، پێویستە جێگای خۆت لەچەند پرۆژەیەکی رێکخراوی مەدەنی، رزگارکردنی شوێنەوارە مێژووییەکان و ژینگەدا بگریت. بەراستی کاتێک هەرکەس و گروپێک لەناو چوار- پێنج رێکخراوی مەدەنی لەجۆری: رێکخستنەکانی ئاشتی تاوەکو دەگاتە کۆمەڵەکانی مافی مرۆڤ، لەپارتیبوونی دیموکراتییەوە تاوەکو دەگاتە کۆبوونەوەو خۆپیشاندانە جەماوەرییەکان، لەیەکێتییەکانی ژنی ئازاد تا دەگاتە یەکێتییەکانی لاوان، منداڵان و بەساڵاچوان، لەئۆرگانەکانی چاپەمەنی و راگەیاندنەوە تا دەگاتە یەکێتییەکانی ئابووری، بازرگانی و داراییەکان، لەوەرزشەوە تا دامەزراوە هونەرییەکان، لەپەروەردەی سەرەتاییەوە تا ئەکادیمیا، لە کۆمەڵەکانی ژینگەوە تا پاراستنی مێژوو و کەلتوور، لەزانستەوە تا دەگاتە تەکنەلۆژیا، بەگوێرەی هێزی خۆی بەشداری تێدا بکات، بەراستی بەواتای بوون بەخاوەن کردار(عمل) دێت. مانەوە لەدەرەوەی ئامانە بەواتای ژیانێکی بێ پراکتیک دێت، ئەمەش واتای ژیان و مردنێکی بێ ئیمان دەبەخشێت.

6 ـ لەمیانەی حەڵاڵ و حەرامەوە مانای ژیان گۆڕاوە. گەیشتن بەهۆشیاری سەردەم و راستی مێژوویی، بوون بەخاوەنی گوزارشتی ئازادانەی زمان و کەلتوور، بەدەستهێنانی مافی رەنج، بەبنەماگرتنی ئەو سیستەمە سیاسی و کۆمەڵایەتییەی ئەمانە فەراهەمدەکات. بوون بەخاوەن ژیانێکی باوەڕمەندی و حەڵاڵ مسۆگەر دەکات. ژیان لەدەرەوەی ئەم بەهایانە، واتە بێبەش بوون لە هۆشیاری سەردەم و راستی مێژوویی، نەبوونی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی دادوەرانە، بەواتای ژیانێکی بێئیمانی و حەرام و نەعلەت لێکراو دێت. پێغەمبەرایەتی و نەریتی ئیبراهیمی راستەقینە تەنیا لەم چوارچێوەیەدا حەڵاڵ و حەرام پێناسە دەکات و پێویستییەکانی جێبەجێدەکات. ئەگەرنا بەبێ ئەوەی واتاکەی بزانیت، نەزانی بۆ کام سەردەم لەجێگای خۆیدایە و تەنیا دوعا بخوێنیت و عیبادەت بکەیت لەگەڵ ناوەرۆکی ئایین و نەریتی ئیبراهیمی ناکۆکە، بەواتای تێکەڵکردنی ویژدان و بوون بەئامراز دێت، ئەمەش مەلەکردنە لەنێو زەلکاوی ژیانێکی پڕ لەحەرام و کفر.

7ـ لەچوارچێوەی گشتییدا خاوەنداریکردن لەناسنامەی راستەقینەی ئورفا و دەوروبەری: کە لەپیرۆزی هەرسێ ئایینەکەدا گوزارشتی لێکراوە؛ رەنجی خولقێنەر، ژیانی ئازاد و بەکەرامەت، جوانی و ئاشتییەکەی، پێوانەکانی دادوەری راستی و ژیان لەمیانەی ئەقڵ و ویژدان. هەموو کارە خێر (چاک)ەکانی لەجۆری نوێژ، رۆژوو، زەکات و کەلیمەی شەهادە و ... هتد. تەنیا ئەوکاتەی بەگوێرەی ئەم پێناسانە رەفتاربکرێت دەیکات بەباوەڕمەند و تێکۆشان لەم رێگایەدا واتادار دەبێت. ئەوکردار و چالاکیانەی کە تەریقەتەکان بەناوی ئایینەوە پەنای بۆ دەبەن، فەرمی بێت یاخود نافەرمی لەجەهالەت (نەزانی) بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. لە کڕنۆش بردن بۆ نەمرودە هاوچەرخ و بتەکان بەولاوە هیچ مانایەکی دیکە نابەخشێت. تەنیا ووشەی (ئەڵڵا) و (نەمرود) جێگۆڕکێیان کردووە. لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا شێوەی ئەو بەهایانەی بەناوی (ئەڵڵا)وە دەپەرسترێت بەگوێرەی سەردەمەکەی خۆی بەتەواوی گوزارشتێکە لەنەمرود. گەورەترین جەهالەت (نەزانی) لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەوەیە کە نرخ و بەهای سیستەمی ئیلاهی بە راستینەی نەمرود دەدرێت. زەنییەت و کردەوە ئایینییەکان کە لە راهیبیە سۆمەرییەکان کۆنەپەرستترە، لەخزمەتی ستەمکار و چەوسێنەرەکاندان، بەڵام بەزارەکی دوعا و سوورەتێکی زۆر ئەزبەرە دەکەن، باس لەفەرموودە دەکەن و مەراسیمەکانی دیکەی عیبادەت پەیرەو دەکەن، دەتوانین ئەمانە تەنیا هاوتای تایفەی نەمرود و ئەبوجەهل بکەین. پارچەکردنی بتەکانی ئەو جەهالەتەی سەدان ساڵە بەڕێوەدەبرێت، لەمیانەی هۆشیاری و چالاکییەکانی بەرگری رەوا، بەشێوەیەک کە بەگوێرەی مێژووی رەنج و ئازادی بێت، بکەوێتە چوارچێوەی پێودانگە نوێکانی شارستانێتی دیموکراتی، بەواتای گرێدان بەپیرۆزی راستەقینەی ئیبراهیمی دێت. کاتێک نەمرودگەرایی هاوچەرخ و بتەکانی لەمیانەی ئەم چەمکەوە هەڵسەنگێنرێت و پێویستییەکانی جێبەجێبکرێت، ئەوکاتە دەتوانرێت باس لەپەیڕەوکردنی رێبازی تەواوی پێغەمبەر و کەسایەتیە پیرۆزەکان بکرێت، ئەو کات دەبێتە خاوەنی ئیمان و ئەخلاقێکی راستەقینە.

هەم وەکو (PKK)، هەم وەکو بەرپرسیارێکی لەپێشینەی ئەو ژیانەی لە ئورفا جێگای باسە، لەو بڕوایەدام لەسەر ئەو بنەمایەی ئاماژەم پێکرد بەرگریکردنێکی راستم بەرامبەر سەردەم و رەخنەدانیشم بەرامبەر بەمێژوو پێشکەشکرد.

لەو بڕوایەدام ئەو رێگایەم رۆشنکردەوە کە لە وڵاتەکەمان و ناوچەکەمانەوە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی پێویست و سوودبەخشە، ئومێدەوارم لەمە بەدواوە ژیان زیاتر لەسەر بنەمای لێبوردن و ئاییندەی ئازاد پێشبکەوێت و رەنجیش بەهای بەرامبەری خۆی بدۆزێتەوە، لەم بارەیەوە مێژوو دەبێتە شاهیدی راستەقینە، بانگەوازی بۆ هەر کەسێک دەکەم ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێبکات و رێزی خۆمتان پێشکەش دەکەم.

2001/7/10

